تۆ لەوە گەورەتری کە بیری لێ دەکەیتەوە ٧

# مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆم

هەڵێنجانی دەروونناسانە لە حیکایەت و نوکتەکانی مەلا نەسرەدین

مەسعود لەعلی





وەرگێرانی: بەرهەم ناودەشتی

**کۆمەڵە وانەیە بۆ پەرەسەندنی نەفس بەرزی و باوەڕبەخۆبوون**

**ئێمە دەڵێین حەقیقەتمان خۆشدەوێت بەڵام زۆرجار ئەو شتانەی کە خۆشمان دەوێن بە حەقیقەت ناویان دەبەین**

**لەم کتێبەدا بۆ یەکەمجار گریمانەی )هێز( باس کراوە**

تۆ لەوە گەورەتری کە بیری لێدەکەیتەوە! ٧

# مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆم

## هەڵێنجانی دەروونناسانە لە حیکایەت و نوکتەکانی مەلا نەسرەدین


**نوسینی: مەسعود لعلی**

وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی



چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە: (٤٧٧)**

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆم ٧
- نوسینی: مەسعود لەعلی
- وەرگێڕانی: بەرهەم ناودەشتی
- بابەت: مەلا نەسرەدین، قسەی خۆش. لایەنەکانی دەرونزانی.
- بەرگ: فواد کەولۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١ دانە

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١١٨٢)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ــــ بازاڕی سلێمانی ــــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێرست

## پێشەکی

کچی مەلا بە چاوی پڕ لە گریانەوە هاتە لای و وتی: (مێردەکەم لێیداوم). مەلا دارێکی دەست دایە و کچەکەی دارکاری کرد و وتی: (ئێستا بڕۆ بە مێردەکەت بڵێ ئەگەر دووبارە لە کچەکەم بدەیت، منیش لە ژنەکەت دەدەم).

تەنیا گۆکردنی ناوی (مەلا ناسرەدین) بەسە بۆئەوەی چیرۆکی پێکەنیناوی تێکەڵ بە گەمژەیی و ساویلکەیی و لەهەمان کاتدا لێوانلێو لە دانایی گشتی بە ئەقڵماندا بێت. ئەو نوکتانەی کە دراونەتە پاڵ مەلا نەسرەدین بە درێژایی ساڵانێك لەناو گەلانی دنیادا دەم بە دەم گواستراوەتەوە (ئەدەبیاتی زارەکی) و لە زۆربەی وڵاتاندا بڵاو بووەتەوە و برەوی پەیدا کردووە. لە تورکیا، عیراق، ئەفغانستان، رۆمانیا، سربیا، ئەودیوی قەوقاز و زۆر شوێنی تردا، ئەم کەسایەتییە گشتی و رۆح سوکە ناسراوە و بە بیستنی کردارە شیرینەکانی، ماندوویێتی لە جەستە دەبەنە دەردەوە. لەداغستان و لەناو ئەرمەنییەکان و جولەکەشدا ناسراوە. نوکتەکانی مەلا نەسرەدین تەنانەت لە ئەمریکاش دەنگدانەوەی هەیە و بە کورتی زۆربەی گەلان و خەڵك دەهێنێتە پێکەنین.

تورکەکان بە (خۆجا) ناوی دەبەن و دەڵێن هی ئێمەیە. عەرەبەکان بە (جوحا) یان (جوحی) ناوی دەبەن و خۆیان بە خاوەنی راستەقینەی دەزانن. جوحا ناوی پیاوێکی عەرەبە کە لە سەردەمی مەهدی خەلیفەی عەباسیدا لە کوفە ژیاوە و لە گەمژەیی و نەزانیدا نموونەی لەسەر دێننەوە و دەشڵێن پیاوێکی تورك بووە و لە

سەردەمی تەیموری لەنگدا بە جوحای رۆمی ناسراوە کە چیرۆکی پێکەنیناویان لەسەر گێڕاوەتەوە.

بەڵام فارسەکانیش بە مەلا نەسرەدین ناویان بردووە و دەڵێن ئێرانییە. بابەت و پرسی کەسایەتی مەلا نەسرەدین زۆر جێگەی سەرنجی توێژەران بووە. لە تورکیا هەندێ توێژەر لەبارەی ژیان و شێوازی کارەکانی، سەرقاڵی توێژینەوە بوون و هێشتا خەریکن. هەندێ کەس دەڵێن لە سەردەمی هارون رەشید دا بووە و هەندێکیش دەڵێن هاوسەردەمی سەلجوقیەکانە و ئەم چیرۆکە زۆر دوور و درێژە...

لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامدا نوکتەکانی جوحا بەناوە نزیکەکان وەکو (مەلا نەسرەدین) یان ناوی دتر بەناوبانگە، بۆ نموونە مەلا لە کەنارەکانی خۆرهەلاتی ئەفریقا، لە دوورگەی (مالت جەهان) لە سیسلی ئیتاڵیا جیوفا یان جیوکایە.

لە یەکێك لە شارەکانی تورکیادا– ئاق شەهر– ناوبەناو فێستیڤاڵێك بەناوی مەلا نەسرەدین بەڕێوە دەچێت، چونکە خەڵکی لەوێ بڕوایان وایە کە ئەو لە شاری ئەواندا کۆچی دوایی کردووە. نوسراوێکی سەر مزگەوتی شار ئەو گومانە بەهێز دەکات کە مەلا نەسرەدین لە ساڵی ١٣٩٢دا مردووە. بەڵام تاوەکو ئێستا هیچ بەڵگەیەك نییە ئاماژە بە راستی و دروستی ئەمە بکات.

بازنەی بابەت و ناوەرۆکی نوکتەکانی مەلا نەسرەدین زۆر فراوانە...بۆ نموونە دەربارەی ئەمیر تەیمور، رۆحانیی ناسراوی کۆنەپەرست و درۆزن، فەرمانڕەوایان و کاربەدەستانی بەرتیلخۆر، خوی کۆن و رۆژانە و ژیانیان سەدان و سەدان نوکتەی لەبارەوە هەیە. ئەم کەسایەتییە خۆشەویست و رۆح سوکە لە قاڵبێکی میللی سادە و خۆشباوەڕیدا دەردەکەوێت کە کارەکانی هەمووی پێچەوانە، ناباو و پێکەنیناویە.

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا، مەلا لەلایەکەوە هۆشیاری و حازر وەڵامی پیشان دەدات و چاوی خەڵك دەکاتەوە و لەلایەکی ترەوە خورافات و دواکەوتوویی و گەمژەیی

دەخاتە بەر توانج و گاڵتەپێکردن و هەوڵ دەدات بۆ لابردنی کەموکوڕییەکانی کۆمەڵگە.

...بە مەلایان وت: (دەتەوێ باوکت بمرێت تا هەموو سامانەکەی بە میرات ببەیت؟)

لە وەڵامدا وتی: (نەخێر، دەمەوێ بیکوژن تا وێڕای سامانەکەی، خوێن باییەکەشی وەرگرم).

بە درێژایی ساڵان و دەیەکانی رابردوو، توێژەرانی وڵاتانی جیاجیا دەستیانداوەتە کۆکردنەوە و چاپکردنی چیرۆکەکانی مەلا نەسرەدین، بەڵام کتێبی (مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆم) یەکەمین نموونەیە کە تیایدا هەوڵ دراوە تەنز و نوکتەکانی ئەم کەسایەتییە خەیاڵی و ئەفسانەیی–مێژوویی وەکو ئامرازێك بۆ وێنەدانەوەی پەیامە دەروونناسییەکان و کۆمەڵناسییەکان و بەتایبەت لەرووی زیادکردنی هەستی متمانە وبڕوابەخۆبوون، لەلایەن خوێنەران و بیسەران سوودی لێوەربگیردرێت.

یەکێك لە گرنگترین سەرقاڵییەکانم بەدرێژایی نوسین و چاپکردنی زنجیرە کتێبەکانی (تۆ لەوە گەورەتریت کە بیری لێ دەکەیتەوە) هێنانە کایەی فرە رەنگی و تازەیی بووە لە بەرگەکانیدا.

ئەم کتێبەش بەو نیازە وەکو حەوتەمین بەرگی ئەم زنجیرەیە ئامادە کراوە.

پاش تەشەنەسەندنی ئەنگێزەکانی نوسینی ئەم کتێبە لە زەینمدا، ماوەی دوو ساڵ سەرقاڵی کۆکردنەوەی سەرچاوەکانی پەیوەست بە چیرۆکەکانی مەلا نەسرەدین بووم. پاشان دەستمدایە هەڵبژاردنی ئەو چیرۆکانەی کە هەستم دەکرد دەتووانم سوودیان لێوەربگرم بۆ پیشاندانی ئەو پەیامە پەروەردەیی و ئەخلاقییانەی کە مەبەستمن. پاش قۆناغی هەڵبژاردن، ماوەیەکی زۆر ئەقڵ و بیرکردنەوەم بە پرۆژەی گشتیی کتێبەکەوە قاڵ بوو. لە کۆتاییدا بڕیارمدا هەموو چیرۆکە

کۆکراوەکان لە دوو تەوەری (هەستکردن بە زەنگینی) و (بڕوابەخۆبوون) ڕێك بخەم. بێگومان ئەو نوکتانەی کە لەم چوارچێوەیەدا جێگەیان نەدەبووەوە لابران، بەڵام لە بەرگەکانی تردا سوود لەو لابراوانە وەردەگرم.

بەڵام چەند خاڵێکی تریش جێگەی سەرنجن:

١-کتێبەکە بۆ دوو بەشی گشتی (هەستی زەنگینی) و (بڕوابەخۆبوون) دابەش بووە. بەڵام لەبەرئەوەی لە روانگەی تیۆرەکەم لەبارەی (هێز) لەم دوو بابەتەم روانیووە، بەشێکی پێشەکی بۆ روونکردنەوە و پیشاندانی پێگەی ئەم دوو تێزە تەرخان کراوە.

٢-ژمارەیەکی بەرچاوی ئەو حیکایەتانەی لەم کتێبەدا دراونەتە پاڵ مەلا لە سەرچاوەی تر وەرگیراون کە لە بنەڕەتدا پەیوەندی بەم کەسایەتییەوە نییە، بەڵکو بە گۆڕینی ناوەکان و هەندێکیش بە گۆڕینی چەند بەشێك لە حیکایەتەکان، مەلام کردووە بە پاڵەوانەکە.

٣-یەکێك لە گریمانە بنەڕەتییەکانی ئەم کتێبە، ئەوەیە کە هەموو کەسێك مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆیەتی. مەلا بە گەمژەیی و ساویلکەییەکەی دەناسین، بەڵام بە کەمێك تێڕامان و لێبووردەییەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە لە زۆر بواردا ڕەفتاری خۆشمان هیچی وەها لە هی ئەو کەمتر نییە. بە دەربڕینێکی تر، لە ناخی هەر یەکێك لە ئێمەدا مەلا نەسرەدینێك هەیە کە هەندێ جار ڕێگەی پێدەدرێت دەربکەوێت و لە برگە جیاجیاکانی ژیاندا ڕێنماییمان دەکات. کەوایە دەبێ لەبری وردبوونەوە لەلاوازییەکانی ئەوانیتر، بە نیگایەکی ڕەخنەگرانە لە خۆمان، هێزمان تەرخان بکەین بۆ چاککردنی تایبەتمەندییە نێگەتیڤ و لاوازییەکانمان.

مەسعود لەعلی

## هێز چییە؟

نزیکەی سالێکە کە بابەتی (هێز) هەموو ئەقڵ و بیری منی بەخۆیەوە قاڵ کردووە: هێز چییە؟ بنەماکانی کامانەن؟ مرۆڤی بەهێز کامەیە؟ کام تایبەتمەندییە رەفتاری و هەستییانەی هەیە؟ چۆن دەتوانێت بگاتە هێز؟ بەدەستهێنانی هێز چ ئەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە؟ ئایا لەنێوان چەمکی هێز لە سیاسەت، فەلسەفە، کۆمەڵناسی، ئاین و دەروونناسیدا هەیە؟

لەم ماوەیەدا هەوڵمداوە تا بە تاووتوێکردنی ئەم چەمکە تیۆرەیەکی گشتگیر لەبارەی (هێز) بخەمە روو. هەرچەندە لەم کتێبەدا مەبەستم نییە بپرژێمە سەر پرسی هێز، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەم بابەتە بونیاد و هەیکەلەی بنچینەیی بیرکردنەوەی ئێمەی پێکهێناوە، هەموو تێز و بابەتەکانی تر لەم چوارچێوەیەدا تاووتوێ دەکەم.

بە پێویستی دەزانم بەر لە هەر شتێك بە خستنەرووی روونکردنەوەیەکی ئەگەرچی کورت لەمەڕ تیۆرەی هێز، پێگەی دوو بابەتی ئەم کتێبە لەو چوارچێوەیەدا شرۆڤە و تاووتوێ بکەم. هەروەها دەڵێم هەستی زەنگینی و بڕوابەخۆبوون– کە دوو تەوەری بنچینەیی ئەم کتێبە پێکدێنن– چ پەیوەندییەکیان بە بابەتی هێزەوەیە.



**لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا چەمکی بنەڕەتی بریتییە لە هێز، هەروەکو چۆن لە زانستی فیزیادا چەمکی بنچینەیی بریتییە لە وزە.**

**(بێرتراند راسل)**

## ئەودیو پەردە بە دژ دەردەکەوێت

لەبەرئــەوەی بــەپێی یاســای دژیــەکی هــەر شــتێك بــە دژەکــەی دەناســرێتەوە، تێگەیشتن لە چەمکی هێز بە تاووتوێکردنی پرسـی (پێداویسـتییەکان و لاوازییـەکان) دەسـت پێدەکـەم. بـە ناسـینی و تێگەیشـتن لـە پێداویسـتییەکانی مـرۆڤ دەتوانیـت بگەیتە تێگەیشتنی قووڵ لە هێز بە مانا بنچینەییەکەی.

زانستی دەروونناسی، زانینی شیکردنەوەی رەفتارە. لەوانەیە گەورەترین قاڵبوونی ئەم زانستە، دۆزینەوە و تاووتوێکردنی هۆکارەکانی پێکهـاتنی رەفتـاری مـرۆڤ بێـت: ئایا ئێمە بوونـەوەری سەربەسـت، خـاوەن ئـیرادە و هەڵبـژێرەرین یـان بەنـدی هێـزە شـــاراوەکانی نـــاوەوە و نائاگایانـــەین، ناچـــاری جێنـــەتیکی، مێـــژووی کەســـی، سەپاندنەکانی ئەو کات و شوێنەی تیایاندا دەژین.

پرسیاری بنچینەیی لـە دەروونناسـیی بزواندنـدا ئەوەیـە کـە کـام هێـز و هۆکارانـە بەرەو ئەنجامدانی کاری تایبەت ئاراستە دەکـات؟ بـەپێی تیـۆرەی پێداویسـتییەکان، مرۆڤ داوا و پێداویستی هەیە و بە بەردەوامی لە هەوڵی ئەوەدایە بیانهێنێتە دی.

**کلیلـی تێگەیشـتن لـە (بۆچـی)ی رەفتـاری مـرۆڤ، تێگەیشـتنە لـە پێداویسـتی و حەزەکانی.**

کاتێك جوڵی مرۆڤەکان لەسەر بنـەمای تێرکردنـی پێداویسـتییەکانیەتی، پرسـیارە گرنگەکە ئەوە دەبێ کە پێداویستییەکانی ئەو کامانەن؟

## پۆلێنبەندی پێداویستییەکان

مەکتەبەکانی دەروونناسی لەسەر بنەمای ‌‌‌ڕوانگە و بنچینە سەرەتاییەکانی خۆیان دەستیان داوەتە پۆلێنبەندی و تیۆریزەکردن لە بواری پێداویستییە مرۆییەکان، بەڵام پێدەچێ بتوانرێ هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ لە دوو گرووپی گەورە و بنەڕەتیدا جیێان بکرێتەوە.

١-پێداویستییە مادییەکان.

٢-پێداویستییە دەروونییەکان.

### ١-پێداویستییە جەستەییەکان

مرۆڤ وەکو ئۆرگانیزمێکی زیندوو و خاوەن جەستە پێداویستی خۆی هەیە. ئەو پێویستی بە خواردن، ئاو، ئۆکسجین و...هەیە تا بەم شێوەیە مانەوەی زامن بکات. ئەم جۆرە پێداویستییانە، بە پێداویستی بایۆلۆژی و بنچینەیی ناو دەبرێن و دەربڕینی هەندێ سەرچاوەی هەندێ لەم پێداویستییانە، پێداویستی ئاژەڵین، چونکە لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا لەم بوارەدا خاڵی هاوبەش هەیە.

### ژیان لە زەمینەی هەبووندا

### (هەبوون یان نەبوون، ئەمەیە پرسیارەکە)

ئەو قۆناغەی هەوڵی مرۆڤ کە سنووردارە بە تێرکردنی پێداویستییە بایۆلۆژی و ماددییەکانی، بە قۆناغی (هەبوون) ناو دەبەین. چونکە لەم بەشەدا، هەموو هەوڵ و جموجۆڵەکانی تەرخانە بۆ بەدەستهێنان و هەبوون: هەبوونی خۆراک، پۆشاک، سەرپەنا، هاودەمی سێکس (پێداویستییە سێکسییەکان بەشێکن لە پێداویستییە بایۆلۆژییەکان)، و بە کورتی هەبوونی سامان و پارە...پارە لەم رووەوە گرنگی هەیە

کـە وەکـو گـرنگترین هۆکـاری لـە دابینکردنـی ئـامرازی تێرکردنـی پێداویسـتییە بایۆلۆژییەکان هەژمار دەکرێت.

لەم قۆناغەی ژیاندا، مرۆڤ لە چوارچێوەی تێرکردنی پێداویستییە جەستەییەکانیدا مانـا پەیـدا دەکـات. بـەپێی ئـەو کەسـانەی کـە لـە قۆنـاغی هەبوونـدان، هێـز واتـە خاوەندارێتی. بەدەسـتهێنانی هەرچـی زیـاتری سـامان، ئاسـایش، فەراهـەم دەکـات. ئاسایش لەم بەشەدا بە فۆرمە مادی و جەستەییەکەی (پاراستنی گیان و سـەلامەتی) پێناسە دەکرێت.

**(بەختەوەری) بە مانای هەبوونی زیاترە**، بـە جۆرێـك کـە تاکەکـەس وا هەسـت دەکات چەندەی زۆرتری هەبێت بەختەوەرترە. بە کورتی لەم قۆناغەدا مـرۆڤ گرنگـی بە جەستە و ژیـانی جەسـتەیی دەدات و ئـەقڵ و رۆح و شـتی پەیوەندیـدار پێیانـەوە کەمترین بایەخی هەیە.

## ٢-پێداویستییە دەروونییەکان

...رۆژێکیـان مـەلا ئامـادە بـوو کـە بچـێتە حـەمام. کاتێـك گەیشـتە حـەمام، حەمامچییەکە وتـی: (ئـەمرۆ حـەمام بـۆ گـەورەپیاوانی شـار کراوەیـە). مـەلا وتـی: (گەورەکانی شار کێن؟ منیش گەورەی شارم). حەمامچیەکە وتی: (گـەورەکانی شـار ئەو کەسانەن کە کاتێك بـەناو شـاردا دەڕۆن هـەمووان سـەیریان دەکـەن. ئـەوان لـە شاردا پەنجەیان بۆ رادەکێشرێت).

مەلا گەڕایەوە ماڵەوە و زەنگوڵ و مەنگوڵی بە زینی کەرەکـەی هەڵواسـی. خۆشـی بە پێچەوانە سواری کەرەکە بوو و چووە کۆڵان و بازاڕی شار. خـەڵکی پێدەکـەنین و ئـەویان پیشـانی یـەکتری دەدا. مـەلا بـە لەسـەرخۆ لـە حەمامەکـە نزیـك کەوتـەوە و لەبەردەم دەرگاکەی راوەستا. بە حەمامچییەکەی وت: (حەمامچـی بـڕۆرە لاوە و بـە هەمووان رابگەیەنە کە گەورەترین پەنجە بۆ راکێشراوی شار دێتە ناو حەمامەکەوە!)

مرۆڤ سەرباری لایەنە مادییەکانی، خاوەنی ڕەهەندی ئەقڵی، دەروونی و ڕۆحییە کە دەبێ بایەخیان پێ بدرێت. **گەورەترین پێداویستیی دەروونی مرۆڤ، پێویستبوونە بە ڕێز، بایەخپێدان و خۆشەویستی.** مرۆڤ حەز دەکات گرنگی پێ بدرێت، حەز دەکات ببینرێت، لە باوەش بگیردرێت، ڕێزی لێ بنرێت و ستایش بکرێت.



**" تینووی خۆشەویستی "**

**بە ژیشکێک دەڵێن:**

**گەورەترین ئاواتت چییە؟**

**لە وەڵامدا دەڵێت: (ڕۆژێک لە ڕۆژان بمگرنە باوەش...)**

مرۆڤ رقی لە تەنیایی، دەرکردن و گۆشەگیرییە. ئەو حەز دەکات لەگەڵ ئەوانیتردا هەست بە سۆز و نزیکایەتی بکات. ویست و حەز بۆ ڕێزگرتن و سۆز لە ساتەوەختی لەدایکبوونەوە لەگەڵیایەتی و لە هەموو قۆناغەکانی گەشە، هەرزەکاری، گەنجی و تەمەنی ناوەڕاست و پیریدا، تیایدا دەمێنێتەوە.

بەڵام چۆن چۆنی دەتوانیت دەستت بگات بە سۆز، گرنگیپێدان و پشتگیریی ئەوانیتر (ئەم پشتگیرییە سەرچاوەی زەمینی و ئاسمانی دەگرێتەوە)؟ فێر بووین بۆ بەدەستهێنانی پارێزگاری و سۆزی ئەوانیتر خۆمان بکەینە مرۆڤی بەهادار و تەواو و خۆشەویست. بڕوامان وایە کە دەبێ ببینە کەسێك کە شایستەی ڕێز و گرنگی پێدانە.

**من خۆشەویستیم کردووە و خۆشیان ویستووم. هەموو شتێکی تر لە ژیانمدا مۆسیقای تێکست بووە.**

**(ستانلی ران)**

## قۆناغی بوون

## (بوون یان نەبوون، ئەمەیە پرسیارەکە)

ئـەم قۆناغـەم لەبـەر ئـەوە بـە قۆنـاغی بـوون نـاودێر کـردووە چـونکە گـەورەترین نیگەرانیی مرۆڤ، (بوون بە کەس)ە.

لەم قۆناغەدا ئامانجی ژیان بریتییە لە بەدەسـتهێنانی باشـییەکان، سـوودوەرگرتن لە شارەزایەتی و بەهرەکان و هەستکردن بە نرخ و پێگە لە ناوەوەڕا و هەروەها هێـز ئاماژەیە بە پێگە و ئابڕوی مرۆڤ. **بەختەوەری، واتە گرنگ و بەنرخ بوون.**

ئاسایش رەهەندی دەروونی هەیە، ئەمەی کە مرۆڤ هەست بکات لەگـەڵ ئـەوانیتردا لە پەیوەندیدایە و تاکێتی ئەو بە رەسمی ناسێنراوە.

## مۆدێلەکانی بەدەستهێنانی بەهاداربوون

لەم قۆناغـەدا تاکـەکان سـوود لـە مۆدێـل و سـتراتیژە جیاجیاکـان وەردەگـرن بـۆ بەدەستهێنانی نرخ و پێگەیشتن. ئەو کەسانەی کە بـەهای مادیـان هەیـە، پرۆسـەی (بەکەس بوون)ی خۆیان لە رێگەی هـەبوون و شـتەکانی خۆیـان سـۆراخ دەکـەن. لـە راستیدا ئامرازی تێرکردنی پێداویستییە بایۆلۆژییەکان لەم قۆناغەدا دەبێتە ئامرازێـك بۆ رازیکردنی پێداویستییە دەروونییەکان.

**نموونەی یەکەم:** هەبوونی سەرپەنا پێداویستییەکی بایۆلۆژییە. بەڵام بۆچـی مرۆڤ دەیەوێ ماڵێکی گەورە و ئیمکاناتی زیاتر لە پێداویسـتییەکانی هـەبێت. چـونکە ئەو بە (هـەبوون)ی مـاڵێکی وەهـا مەبەسـتیەتی سـەرنج و ستایشـی ئـەوانیتر بـەلای خۆیدا رابکێشێت، هێزی و توانا و سەنگی خۆی بسەلمێنێت.

**نموونەی دووەم:** مرۆڤ پێویستی بە جلە. ئەو بەو شتەی کە لەبەری دەکات خۆی لەبەرانبەر گەرما و سەرما دەپارێزێت. بەڵام ئەگەر دابینکردنی پۆشاک ببێتە واسواسییەکی توند لە تاکەکەسدا و هەموو نیگەرانییەکەی بریتی بێ لە بەدەستهێنانی جلی نوێ و هەمەڕەنگ و بەردەوام خەمی ئەوە بێت حوکم لەسەر ئەوانیتر بدات لەبارەی ئەو پۆشاکەی کە هەیانە، چیتر جل و پۆشاک تەنیاوتەنیا پێداویستییەکی بایۆلۆژی نابن، بەڵکو ئامرازێك دەبن بۆ راکێشانی ستایش و سەرنج.

**مەتەڵێك**

**–بۆچی خانمەکان گرنگی بەوە نادەن ببنە یاریزانی تۆپی پێ؟**

**–چونکە سەختە بۆ خانمێك وەکو تۆ کەسی تر جل لەبەر بکات.**

لەم ستراتیژەدا (هەبوون) بە ئامانجی بەدەستهێنانی شوناس، هێنانەکایەی هەستی بەهاداربوون و سەلماندنی خود بەرانبەر ئەوانیتر سوودی لێوەردەگیردرێت. لێرەدا دروشمی (من دەوڵەمەندم کەواتە هەم) بۆ ئەم رێسایە دەگۆڕێت (من دەوڵەمەندم کەواتە کەسێکم).

لە تەك ئەم مۆدێلەوە، دەشێ تاکەکان لە رێگەی تریشەوە بیانەوێ پرۆسەی (بە شتبوون) بگرنە بەر. دەشێ هەندێ کەس لە رێگەی بەدەستهێنانی پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی، گروپێك بە بەدەستهێنانی زانین و نازناوی زانستی و کۆمەڵێکی تر لە رێگەی پاڵەوانێتی وەرزشی و یان تەنانەت لە رێگەی برینی پلیکانەی مەعنەوییەوە بیانەوێ هەستی پایەبەرزی و بەهاداربوون ئەزموون بکەن.

# له پێویستبوونەوە تا بێ پێویستی

تاوەکو ئێرە ئاماژە بەوە درا کە مرۆڤ چاوەڕوانی و ویستی هەیە و هەوڵدان بۆ تێرکردنیان بەشێکی بەرچاو لە پاڵنەرەکانی رەفتاری پێکدێنێت. بەڵام ئاخۆ دەتوانرێ هەموو کردار و چالاکییەکان لە چوارچێوەی تیۆرەی پێداویستییەکاندا شی بکەینەوە و ئاراستە بکەین و ژیان تەنیا بە فەزایەك بۆ پرژانە سەر خود و گەیشتن بە خواست و خەونە کەسییەکانمان لەقەڵەم بدەین؟

هەڵبەت وەڵامەکە نێگەتیڤە. مێژوو و ژیانی رابەرانی گەورە، بیرمەندانی ئازاد و مرۆڤەکان بەرزەکان پیشانی دەدات کە بەپێی پرۆسەی خۆپەرستانە و تاکرەوانە، ئەو گەورە پیاوانەش ژیاون کە تەرکیزی خۆیان خستووەتە سەر بەرەپێشبردن و بەرزکردنەوەی کۆمەڵگە و هاوتاکانی خۆیان. ئێمە شێوازی ژیان و ئەو رەفتارانەمان بینیووە کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە کەسییەکان نەبووە. چۆن دەتووانین ئەم جۆرە رەفتارانە شرۆڤە بکەین و کام هۆکارانە بژمێرین بۆ سەرهەڵدانیان، لێرە بەدوایە کە دەچینە ناو رووبەری بێ پێویستی، قۆناغێك کە تیایدا نەك کەموکورییەکان و پێویستییەکان بەڵکو هێز و هۆشیاریی بێگەرد و عەشق، پاڵنەری رەفتار پێکدەهێنن. لەم قۆناغەدا (من)ی نەفسانی بەلاوە دەنرێت و (من)ی جیهانیی بێبەری لە هەموو جۆرە نەفسانیەتێك دێتە کایەوە.

# ژیان لە رووبەری بوون( بێ پێویستی)دا

## بوون یان نەبوون، ئەمەیە پرسیارەکە

(بوون) لەبەرانبەر (هەبوون)دایە. لە دوو قۆناغی پێشوودا، جوڵە و هەنگاونان بە مەبەستی هەبوونی شتێك و یان بوون بە کەسێك ئەنجام دەدرا. جوڵە بۆ خواستە و خواست ئاماژەیە بە کەموکوڕی و پێویستبوون:

> **هەوڵ شتێك نییە جگە لە ململانێ لەنێوان ئەوەی کە هەیە و ئەوەی کە دەبێ هەبێت.**
>
> **کریشنا مورتی**

بەڵام (بوون) بوونە. بێدەنگ و کپ بوون. هۆکاری ئەم کپییەش نەبوونی پێویستی و پێداویستییە. کەی دەست لە هەوڵ و تەقەلا هەڵدەگرین؟

## دەست لە ویستم هەڵئەگرم تا دڵ ئاسودە دەبێ

شێر دەست دەکات بە جوڵە بۆ راو. کاتێك کە نێچیر لە چنگی ئەودا گیرۆدە دەبێت، هەوڵ و تەقەلا کۆتایی دێت.

یانزە یاریزانی تۆپی پێ لە هەوڵی رەتکردنی تۆپدان بەناو گۆڵی رکابەردا. کاتێك کە تۆپ چووە ناو گۆڵەوە، جوڵە و هەوڵ دەوەستێت. رووبار لە جوڵەدایە. لە هەوڵی گەیشتن بە دەریادایە و کاتێك دەگاتە دەریا، ئارام دەبێتەوە.

دەریا واتە کپی، واتە بێ پێویستی. بوون واتە بوون بەدەریا. رۆیشتن بەرەو ئەودیوی پێداویستیەکان و ویستنیان. کاتێك پێویستبوون کۆتایی دێت، کپی و بوون دەست پێدەکات. بێ پێویستی ئاشکراکردنی ئەم راستییەیە: (شوێنێك نییە بۆ پێی بگەیت، شتێك نییە بۆ هەتبێ و کەسێك نییە بۆ ببیت پێی).

# درامـــای پەرداخـــەکان

## (هەوڵێك بۆ تێگەیشتن لە چەمکی بێ پێویستبوون)

دوو پـەرداخی ئـەلف و ب لەبەرچـاو بگـرە. پـەرداخی ئـەلف بـە تـەواوی پـڕە و پەرداخی ب بەتاڵە. برێك ئاو دەکەینە ناو پەرداخی ئەلف. چی روودەدات؟ پـەرداخی ئەلف هیچ ئاوێك ناگرێتە خۆی، چونکە پڕە و هیچ رووبەرێکی نـەماوە. چـەندەی ئـاو بکەینـە نـاوی لەسـەریەوە دەڕژێـت. ئێسـتا بڕیـار دەدەیـن برێـك ئـامو بکەینـە نـاو پـەرداخی ب. پـەرداخی بـەتاڵ تـا ئـەو کاتـەی کـە پـڕ نـەبێت، هەرچـییەك کـە وەریدەگرێت، لە خۆیدا شوێنی دەکاتەوە.لە راستیدا درامای پـەرداخی پـڕ، باشـترین ئامرازە بۆ تێگەیشتن لە چـەمکی بـێ پێویسـتبوون. پـەرداخی پـڕ بـەهیچ شـێوەیەك هیچی ناوێت. **تەمەنا، حەز و ویستن نیشانەی کەمبوون و بەتاڵییە.**

## هێز واتە بێ پێویستی

هێز بە مانای بێ پێویستییە. هێز، واتـە لێوانلێوبـوون، تـەواوبوون، پڕبـوون و بـێ پێویستبوون.

پەرداخێکی پڕ دوو تایبەتمەندی هەیە:

١–نەویستن (وەرنەگرتن). کاتێك تۆ پێویستت بە هـیچ نییـە، هیچـت ناوێـت. هێـز هیچی ناوێت و ناسەنێت چونکە کێماسی نییە.

٢–خسـتنەڕوو (پێـدان). چـەندەی ئـاو بکەینـە نـاو پـەرداخێك کـە پـڕە لـە ئـاو، لەسەریەوە دەڕژێت و پەرداخەکە ئاو دەبەخشێتە دەوری خۆی.

پێدان نیشانەی بێ پێویستییە. پێدان، واتە عەشق و عەشق واتە هێـز و هێـز واتـە بێ پێویستبوون.

نەریتی هەورە کە هەرچییەك لە دەریای وەرگرێت
کۆی بکـــــــاتەوە و هەمووی بکاتەوە ناو دەریا
(سەعدی)

## خودا بیٚ پێداویستییە

کلیلـی ناسـینی خـودا دەرك کردنـە بـە صـەمەدیەت (بـیٚ پێویسـتی)ی ئـەو. ئـەو یەکتایە و بیٚ پێداویستێکی رەهایە. نە لەدایکبووە و نە لەدایك دەبێـت. مـەزن و بـیٚ هاوتایـە. خوداوەنـد میهرەبانـە، خۆشەویسـتی ئـەو بـیٚ بەنـد و مـەرج و رەهەنـدی بەخشندەیی و بەبەزەییبوونی بەهۆی هێز و بیٚ پێویستبوونیەتی.

عەشق لە هێز لەدایك دەبێت. عەشق لە رووبەری هێزدا سەرهەڵدەدات. لە قۆنـاغی بیٚ پێویستیدایە کە قوربانیدان، هاوتادۆستی و جوامێری دێنە ئاراوە.

پەرداخی بەتاڵ دوو تایبەتمەندی هەیە:

**١–ویستن:** پەرداخێکی بەتاڵ نیشانەی تەمـەنا و تکایـە. پـەرداخی پـەتاڵ تـا بـڕ نەبێت، هەر وەردەگرێت. هەرچییەکیشی تیٚ بکرێت دەیەویٚ و قبوڵی دەکات.

**لە گریانی منداڵەوە تا عەشقی کچ و تکای عاشق هـەمووی رەنگێکـی ویستنە. (ڤیکتۆر هوگۆ)**

**٢–نـەدان و نەبەخشـین:** بـەتاڵی و پێویسـتبوونی پـەرداخی بـەتاڵ رێگـە نـادات ئـەوەی کـە دەیسـەنێت بیـدات و بیبەخشـێت. مرۆڤـی بـەتاڵ، پێداویسـتی هەیـە و

خۆپەرستە. خۆپەرستی گرنگترین نیشانەی لاوازی و ئەویترخوازی و بەرزترین بەڵگەی هێزە. کەسێك کە پێداویستی هەیە ئەوەندە گیرۆدەی ئاوات و پێداویستییە کەسییەکانیەتی کە ناتووانێت بیر لە کێماسی، کێشەکان و بەرژەوەندییەکانی ئەوانیتر بکاتەوە و یارمەتییان بدات. چیرۆکی پێداویستی و خۆپەرستی پشتڕاستکەرەوەی (ئەو چرایەیە کە بۆ ماڵەوە رەوایە و بۆ مزگەوت حەرامە).

## رووبەری خۆناسین

خۆناسین کلیلی ئازادی و سەربەستییە. کلیلی چوونە ناو رووبەری دواترە. لەنێوان بێ پێویستی و پێویستبوونی قۆناغی (خۆناسین)دایە. کاتێك مرۆڤ مەعریفەی نەفسی بەدەستهێنا دەتووانێت بەرەو قۆناغی بوون هەنگاو هەڵێنێت. پرسی جۆراوجۆر لە خۆناسیندا هەن، بەڵام گرنگترین بابەت کە جێگەی باسە، وەڵامە بۆ دوو بابەتی بنچینەیی:

١-**مرۆڤ چییە؟** (ئاماژەیە بە سێ رەهەندەکەی بوونی مرۆڤ، جەستە، ئەقڵ، رۆح)

٢-**مرۆڤ کێیە؟** (ئەم رۆحە ئەبستراکتە چ شوێنێکی لە جیهانی بووندا هەیە و بۆچی هاتووەتە ئەم دنیایەوە (فەلسەفەی دروستبوون)

وەڵام بۆ دوو پرسیارەکەی سەرەوە کرۆکی سەرەکی بابەتی گرنگی خۆناسینە.

**هاتنم بەدەست خۆم نەبوو هێنایانم**

**دەرچوونەدەریشم چۆن و کەیە نازانم**

**رۆیشتین بە نابەدڵییەوە و نازانین چی بوو**

**هەموو مەبەستی ئەم هاتن و چوونە**

**(خەیام)**

بابەتێك كە زانینی، گەورەترین مەعریفەیە:

**بەرزترین زانین، زانینی مرۆڤە لەبارەی خۆیەوە.**

و ناهۆشیاری لە گەورەترین نەزانییەكان:

## گەورەترین نەزانی، ناهۆشیاری مرۆڤە لەمەڕ خۆی.

قۆناغی خۆناسین لەو رووەوە گرنگە كە بە بڕینی، مرۆڤ تێدەگات هەموو ئەوەی كە وەكو خواست و پێویستی بەدوایەوەیەتی، خودی رەسەنی خۆیەتی، خودێك كە بێبەرییە لە هەموو كەموكوڕی و پێداویستییەك، كامڵ و تەواوە.

لە رۆژێكی هاوینیی جواندا كرمێكی زەوی بەناو پوش و پەڵاشدا دەخزا. ئەو تەنیا بوو. هەروا كە بەرەو پێش دەجوڵا لەبەر خۆیەوە دەیگوت: (چی ئەبوو گەر من هاوسەرێكم بدۆزیایەتەوە كە دەمتووانی لەگەڵیدا بەختەوەر ببم!)

لەناكاو سەری هەڵبڕی و لەبەرانبەر خۆیدا كرمێكی زەویی تری بینی كە فریودەر و جوان بوو. لە چاوتروكانێكدا عاشقی بوو. پێی وت: (دڵدارەكەم دواجار تۆم دۆزییەوە. وەرە با لەگەڵ یەكتریدا پیر بین).

بەڵام ئەو كرمە وتی: ( بێدەنگ بە گەمژەی بێ چاوڕوو. من كلكی خۆتم...)

خۆمان نیوە بزربووەكەی خۆمانین. سەرچاوەی ئەو عەشق و ئارامییەین كە لەوانیتری داوا دەكەین. هەر ئەو رووناكییەین كە دەمانەوێ بەهۆیەوە دنیامان رۆشن بكەینەوە. هەر ئەو گەنجینەیەین كە بەدوایەوەین. هەر ئەو ئامانجەشین كە بۆ گەیشتن پێی هەنگاو دەنێین و بەرگەی رەنجی سەفەر دەگرین. دووبارە دەڵێین: شتێك نییە بۆ بەدەست هێنان، شوێنێك بۆ گەیشتن و كەسێك بۆ بوون نییە.

## پەیوەندیی خۆناسین و خودا ناسین

سەرەتای خوداناسی، خۆناسییە و لە خۆناسیندایە کە خودا دەدۆزینەوە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی سەربەخۆ نییە. ئەو بەشێکە لە راستییەکی گەورەتر. ئەو رایەڵە بە ئەفرێنەری بالا. خۆناسین تێگەیشتنە لەو راستییەی کە ئێمە لەگەڵ خوداین. **(ئێمە لە دەماری مل لەو نزیکترین)**. دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەویش. **(لەوین و بەرەو لای ئەو دەگەڕێینەوە)**. بەها و سەنگی ئێمە لەلایەن بەرزترین سەرچاوەی بوون پەسەند کراوە: **(کەرامەتمان بە منالەکانی ئادەم بەخشی..)**

بۆ ئەنجامدانی ئەرکێك و پەیامێکی ئاسمانی پێمان خستووەتە سەر ئەم زەوییە:

پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی فەرموو: من جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێم.

حەقیقەتی خودی ئێمە، هێز، تەواوی و جوانییە. ژیان دەرفەتێك نییە بۆ کامڵبوون و پێگەیشتن و بەهاداری. ژیان ئەزموونی ئەوەیە کە هەین. نەهاتووین تا مەزن و دڵگیر ببین. هاتووین تا جوانی و مەزنایەتیمان ئاشکرا بکەین. بوونمان ئەزموون بکەین. ژیان دەرفەتێك نییە بۆ هەبوون و بوون. کاتێکە بۆ ئەزموونی هەموو ئەو بالایی و شکۆیەی کە لە خودی ئێمەدا هەیە. مرۆڤ ئاوێنەی جوانیی خودابیە.

**ژیر وەکو ئەو ئاوێنەیەیە کە خوداوەند خۆی تیادا دەبینێت.**

**(محیەدین عەرەبی).**

مرۆڤ ئایەت و نیشانەی تەواوێتی خودایە. لە رێگەی ئەزموون و دەرکەوتنی ئەوەی کە هەین، جوانی و گەورەیی خودایی ئاشکرا دەبێ.

**من گەنجینەیەکی شاراوە بووم دەمویست ئاشکرا ببم.**

**(فەرمودەی قودسی)**

ئێمە ئەوە نین کە بیری لێ دەکەینەوە. ئەوە نین کە پێیان وتووین. ئێمە ئازیزتر و مەزنترین لەوەی کە هەین.

**فەلسەفەی ژیانتان لە (هەبوون) و (بوون بە)ەوە بگۆڕن بۆ ئەزموونی بوون.**

# هەستکردن بە زەنگینی و بڕوابەخۆبوون و تیۆرەی هێز

## ئەلف–هەست بە زەنگینی

....مەلا نەسرەدین عاشقی کچێك بوو. ڕۆژێکیان بە سۆزێکی زۆرەوە پێی وت: (تۆ جوانترین و دڵگیرترین ژنی کە تاوەکو ئێستا بینیوومە و ناتوانم بێ تۆ بژیم).

بە بیستنی ئەم قسەیە، کچەکە لە خۆشییا دەستیکرد بە گریان. ئەو کاتە مەلا گەڕایەوە و وتی: (بەڵام من لە ژیانمدا ئەم قسانەم بە زۆر ژن وتووە. وتوومە ناتوانم بێ ئێوە بژیم، بەڵام درێژە بە ژیان دەدەم و مەبەستمە بە جۆرێك بژیم کە دەرفەتم هەبن تا بۆئەوەی هەر ئەم قسانە بە ژنی تریش بڵێم).

ئەم قسانە کچەکەی بە توندی ئازار دا و تورەی کرد. پاشان مەلا وتی: (من گاڵتەم کرد و بە ڕاستی بەبێ تۆ ناتوانم بژیم) و کچەکە جارێکی تر دڵخۆش بوو.

**سەرەکیترین وشە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی هەستکردن بە زەنگینی، بەهایە.**

هەستی زەنگینی ئاماژەیە بە ئاستی ئەو بەها، سەنگ و ڕێزەی کە تاکەکەس بۆ خۆی دادەنێت. بەرزترین هەستی زەنگینی پاش قۆناغی خۆناسین بە دەست دەهێنرێت، واتە ئەو قۆناغەی کە مرۆڤ بە هۆشیارییەوە لە ناوەرۆکی خۆی وەکو گیانێکی نەمر کۆتایی بە (بەکەس بوون) دێنێت.

ئیتر بەلایەوە گرنگ نابێت کە ئەو بە گرنگ لە قەڵەم بدەن یان نا، گرنگبوون ئیتر هیچ بایەخێکی نابێت بۆی. کەسی ڕێز لەخۆگر بەتاڵە لە هەوڵی ڕازیکردنی ئەوانیتر و پەسەند بوون و بوون بە هاوڕەنگی جەماعەت و چیتر نیگەرانی ئەوە نابێت ئاخۆ تاکەکان چۆن حوکمی لەسەر دەدەن.

**ب–بڕوابەخۆبوون**

**(ئایا نازانن کە خودا ئەوەی کە لە ئاسمان و زەوییە خستووەتە بەردەستی ئێوە).**

گرنگترین وشە بۆ تێگەیشتن لە چەمکی بڕوابەخۆبوون (توانایی)یە: باوەڕبوون بە توانا و لێهاتوویی تاکەکەسییەکان بۆ دیاریکردنی چارەنووس، هێنانەکایەی گۆڕانی خوازراو و دروستکردنی ژیانی دڵخوازە.

بڕوابەخۆبوون بەزۆری (و بە تەواوی نا) پەیوەندی هەیە بە قۆناغی هەبوونەوە. قۆناغێك کە مرۆڤی ئیماندار بە تواناکانی خۆی و دۆزینەوەی یاساکانی ژیان و بوونەوەران (لەوانەش یاسای بەکێشکردن) خۆی بە باڵادەست بەسەر ژیاندا دەبینێت و مەبەستیەتی پشکدار بێت لە بەهرەکانی و تێرکردنی پێویستییە مادییەکانی.

## تێگەشتن لە مانای بێ پێویستبوونی مادی

لە بێ پێویستی دەروونیدا کە تاکەکەس دەگاتە بێ پێویستی رۆحی تەواو بە جۆرێك کە وابەستە نییە بە هیچ هۆکارێکی دەرەکی و ئالودەبووانە. ئەو ئاست و رێزەی کە بۆ خۆی دادەنێت دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەس بە سەرۆك، ئاغا، گەورە و وەلی خۆی دادەنێت.

**گەر تۆ هەبیت دەتوانم سەد ساڵ بێ گیان بژیم**

**بێ تۆ گەر سەد گیانیشم هەبێت ساتێك ناتووانم بژیم**

بەڵام بێ پێویستبوون لە قۆناغی هەبووندا بە چ مانایەکە و مرۆڤ چۆن چۆنی دەتووانێت لە رێگەی خۆناسینەوە لە ئاستی مادیدا بگاتە دەوڵەمەندی و ئازادی؟

راستییەکەی ئەوەیە کە جەستەی ئێمە وەکو بەشێك لە سێ رەهەندەکەی بوونمان (رۆح، ئەقڵ، جەستە) پێداویستی نکوڵی نەکراوی هەیە و هیچ مرۆڤێك تەنانەت لە بەرزترین قۆناغەکانی بووندا ناتووانێت جەستەی خۆی لە پێویستییە مادییەکان قوتار بکات. بێ پێویستی لە قۆناغی هەبووندا بە پێچەوانەی قۆناغی (بوون بە) رێژەییە و رەها نییە. بێ پێویستبونی مادی بە مانای فەرامۆشکردنی خواستەکان و پێداویستییە جەستەییەکان نییە **بەڵکو بەمانای بە تەوەرنەکردنیانە لە ژیاندا و قوتاربوونە لە چاوتێبڕین و چاوچنۆکی. وابەستەنەبوون بەو مانایەیە کە فەلسەفەی ژیان و هەرچی هەوڵ و ماندووبوونە، ئاراستەی دروستکردنی ژیانێکی مادی نموونەیی نەبێت.**

## دراماى ئەرك پێ سپاردن

بۆ تێگەیشتنی باشتر لە رۆڵ و پێگەی مادیات و پارە لە ژیاندا، من سوود لە دراماى ئەرك پێ سپاردن وەردەگرم. وایدابنێ پاشایەك كەسێك بۆ ئەنجامدانى ئەركێك دەنێرێتە شوێنێكى دووردەست. دەبێ ئەو پەیامێكى گرنگ بگەیەنێتە ولاتێكى دوور. كابرا بۆ ئەنجامدانی ئەركەكە ئامادە دەبێت، پرێسكەكەی هەڵدەگرێت و بە داشقەیەك كە بۆی دابین دەكرێت سەفەرەكەی دەست پێدەكات.

ئەم باڵیۆزە رۆژ و شەو بە رێگەوەیە و بە خێرایی بەرەو شوێنی مەبەست دەڕوات. هەر جارێك كە ماندوویێتی و تینوویێتی بەسەر خۆی و ئەسپەكەیدا زاڵ دەبێت، لە شوێنێك دادەبەزێت. ئەسپەكەی تیمار دەكات و ئاو و خۆراكی دەداتێ و دووبارە دەست دەكاتەوە بە سەفەر. رۆژ و هەفتە هەر بەم شێواز بەڕێوە دەچێت تا ئەوەی كە دەگاتە شارەكە و لەوێ بۆی دەردەكەوێت بازرگانێك كاڵاكانی خستووەتە هەڕاجەوە.

نێردراوەكە لەبەر خۆیەوە دەڵێت بە كڕینی كاڵای بازرگانی و فرۆشتنەوەی لەو شارەی كە لەسەر رێگاكەیەتی، دەتووانێ قازانجێكی زۆری دەست بكەوێت، ئەو نیگەرانی ئەسپەكەیەتی. لەبەر خۆیەوە دەڵێت بەو قازانجەی دەستم دەكەوێت دەتووانم ئەسپێكی تازە بۆ خۆم بكڕم.

نێردراوەكە لە شاری دواتر دا لە رێگەی فرۆشتنەوەی ئەو كاڵایەی كە لە بازرگانەكەی كڕیبوو، قازانجێكی زۆر بەدەست دێنێت بە جۆرێك كە هان دەدرێت تا لەبری كڕینی ئامرازی سەفەر بەو پارەی كە بەدەستی هێناوە، دووبارە كاڵای نوێ بكڕێت و بە فرۆشتنەوەی، سامانەكەی زیاد بكات. هەرچەندە ئەم كار و تەقەلایە

کتومت پەیوەندی بە ئەرکەکەی ئەوەوە نییە، بەڵام لەبەر خۆیەوە دەڵێت بەو پارەیەی کە دەستی دەکەوێت هەلومەرجێکی باشتر بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی دەهێنێتە کایەوە. لە هەمان کاتیشدا دەتوانێت خەڵکانێك بەکرێ بگرێت تا بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ ئەرکەکەی بەجێ بگەیەنن...

بەم شێوەیە چیرۆکەکە درێژەی دەبێت کە نێردراوەکە سامان و قازانجێکی زۆر لە رێگەی مامەڵەکانییەوە بەدەست دێنێت و پەیتا پەیتا دەبێتە بازرگانێکی دیار و دەوڵەمەند، بازرگانێك کە ئیتر ئەرکەکەی خۆی فەرامۆش کردووە و نازانێت ئامانج و پەیامە بنچینەییەکەی چی بووە...

## هەر مرۆڤێك نێردراوێكە

بە ئامانجی ئەركێكی گەورە و شكۆمەندانە هاتووینەتە ئەم دنیایەوە:

**(ئایا پێتان وایە بێهودە ئێوەمان خولقاندووە).**

**هەر كاتێك گەیشتنە ئەو یەقینەی كە ژیانتان ئەركێكی شكۆمەندانە و قارەمانانەیــە، خۆتــان لەگــەڵ پــڕۆژە و ڕێســای خــودایی بــۆ ژیــان، هەماهەنگ و سازگار كردووە.**

(ئەسپ و داشقەكە)ی ئێمە جەستەی ئێمەیە. جەستە ئامرازێكە دەبێ ئاگامان لێی بێت و بایەخ بە پێداویستییەكانی بدەین. بەڵام ئەم بایەخدانە نابێت تا ئەو شوێنە ڕێ بكات كە ژیانمان گەمارۆ بدات و لە ئەنجامدانی ئەركی خۆمان لامان بدات. بەڵام شوناسمان پەیوەندی بە جەستەگەرایی ئێمەوە نییە.

**لە سەر خاكی ئەوانیتردا ماڵ دروست مەكە**

**كاری خۆت بكە كاری بێگانە مەكە**

**كێیە بێگانە، جەستەی خاكیی تۆ**

**كە بۆ ئەوە خەمناكیی تۆ**

**(مەولەوی، مەسنەوی مەعنەوی)**

دەبێ هەموو چالاکییەکانی ژیان لە ئاقار و لەسەر بنەمای (بۆچی)ێتی ئامادەییمان لە سەر ئەم زەوییە خاکییەدا پلانی بۆ دابنرێت، واتە لەسەر بنەمای دوو پرسیاری بنچینەیی **لە کوێوە هاتووم؟ هاتنم بۆ چی بوو؟**

**من لە دنیادا وەکو رێبوارێکم کە لە سێبەری درەختێکدا دادەنیشێت و پاشان هەڵدەسێت و دەڕوات و بۆ ئەوانیتر جێی دەهێڵێت.**

**(فەرموودە)**

لە سوکراتیان پرسی: (بە چ خەسڵەتێك عەیبە لە هەوڵی خەڵکی سەردەمی خۆت دەگریت؟) وتی:

(هەوڵی من خواردنە تا بژیم و هەوڵی ئەوان ژینە تا بخۆن!)

**خواردن بۆ ژین و زیکر کردنە**

**وا مەزانە ژین بۆ خواردنە**

**(سەعدی)**

هەرچەندە دەبێ بۆ زیندوو مانەوە خواردن بخۆین، نابێت لەپێناو خواردندا بژین.

هەرچەندە بۆ سەلامەتی و پشوودان دەبێ بخەوین، بەلام نابێت بۆ خەوتن بژین.

هەم (هێز) و هەم (لاوازی) ژیانی مادییان هەیە، بەلام بە دوو تێڕوانین و دوو ئەنجامی جیاواز. هێز و لاوازی هەردووکیان بەدوای پارە و بەدەستهێنانی سوودەوەن، بەڵام لاوازی دەژیت تا پارە بەدەست بێنێت و هێز پارە بەدەست دێنێت تا بژیت و بەرپرسیارێتییەکەی راپەڕێنێت. ئەو لەکاتێکدا کە هەست بە بەختەوەری و ئارامی دەکات، ژیانی پڕ دەبێت لە بەرەکەت.

مەولەوی نموونـەی دوو جـۆر ئاسـك دێنێتـەوە. ئاسـکی میسـك کـە بـۆنی خۆشـی لەخۆیـدا هـەڵگرتووە و لـە خوتن(تورکسـتانی چـین) دەژیـت و ئاسـکی ئاسایی...هەردووکیشـیان گیـاخۆرن، بـەڵام یـەکێك عـەتر لـە خـۆی دەردەدات و ئەویتریان پیسایی.

**گیا و ئاو خۆرن هەردوو جۆرە ئاسکەکە**

**ئەمیان قشپل ئەکات و ئەویان میسکەکە**

هەروەها قامیشی شەکر و قامیشی ئاسایی کە هـەردووکیان لـە یـەك سەرچـاوەوە تێراو دەبن، بەڵام یەکێکیان ناوەوەی بۆشە و ئەویتریان پڕ لە شەکر.

**هەردوو قامیش لە یەك ئاو دەخۆنەوە**

**ئەمیان بەتاڵ و ئەویان پڕە لە شەکر**

**و مرۆڤەکانیش:**

**ئەمیان ئەو هەموو نێرەیی و چاوبرسێتییە دەردەخات**

**ئەویان ئەو هەموو عەشقە خودابیە بەرپا دەکات**

**ئەمیان پڕە لەو هەموو خراپە و دزێوییە**

**ئەویان پڕە لە رووناکی خودا**

بوونی پارە لە ژیانی مرۆڤدا پێویستە. بەڵام دەبێ لە خۆمان بپرسین کە چ پێگە و رۆڵێکی بۆ دیاری بکەین؟ و بە چ ناونیشانێك لە ژیاندا کەڵکی لێوەرگرین.

مرۆڤ تا شوێنگەی خۆی لە جیهانی بووندا پەی پێ نەبات، ناتوانێت شوێنی پـارە و ژیـانی مـادیی خـۆی لـە ژیانیـدا دەستنیشـان بکـات. هـەموو کێشـەکان، بـێ

سەروبەریەکان، بیٚ ئاگاییەکان، زیان و سەرگەردانییەکان هەر لەو خاڵەوە دەست پێدەکەن. شوێنێك کە بە هەڵە بۆ مادیات دیاری دەکەین و دەیکەینە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە هەموو شتەکان و نەهێشتنی هەموو کەموکوڕییەکان و ئەزموونی ئارامی و بەختەوەری، بیٚ ئاگا لەوەی کە هێز، ئاسایش، ئازادی و ئارامیی بنچینەیی بە دۆزینەوەی خودی راستەقینە و توڕ هەڵدانی (خودی خەیاڵی) و دۆزینەوەی پێگەی بنچینەییمان مەیسەر دەبێت.

## ئەنجام

### باوەڕە بنەڕەتییەکان بۆ تێگەیشتن لەپێگەی بیٚ پێویستبوونی مادی

١–مرۆڤ گیانێکە کە جەستەی هەیە نەك جەستەیەك کە گیانی هەیە.

٢–رۆح بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی پیرۆز هاتووەتە ئەم دنیایەوە.

### باڵندەی باخی مەلەکوتم نەك دنیای ئەم خاکە

٣–رۆح بۆ ئامادەبوون لەم دنیایەدا پێویستی بە قاڵب و ئامرازی مادی (جەستە) هەیە.

٤–سەرنجدان و بایەخدان بە پێویستییە مادییەکان لە ئاقاری بەجێگەیاندنی پەیامی مرۆییدا گرنگی پەیدا دەکات و خۆی لەخۆیدا بەهای نییە. بەو گریمانەیەیە کە لە بەشی سێیەمدا ئەو پرەنسیپ و رێکارانە پیشان دراون کە تاکە بەتوانا و بڕوابەخۆکان بۆ تێرکردنی ویستی مادی کەڵکیان لێوەردەگرن.

شایەنی باسە کە لە بەشی دووەمیشدا قسە لەسەر چوار ئەنجامی گەورەی کـەمیی هەستی زەنگینی، واتە خۆ بە کەم زانین، خۆپەرستی، خۆدەرخسـتن و خۆسـەپاندن کراوە. لەم بەشەدا باسی دوو گروپی کەسایەتیی (هێز) و (لاوازی) دەکەین وەکو دوو رەمز کە لە دوو رووبەری بوون و هەبووندا دەژین.

# بەشی دووەم

## کەمیی هەستکردن بە زەنگینی و کەموکوڕیی ڕەفتاریی بێ ئەزموون

**هەمەگیر:**

١-خۆ بە کەم زانین

٢-خۆپەرستی

٣-خۆگەورەبینی و خۆدەرخستن

٤-خۆسەپاندن

# ١
# خـــۆ بە کــــەم بینین

سپێدە هاتمە شوێنت بۆ راو چووبوویت

تۆ خۆ سەگت نەبردبوو بەچ ئیشێک چووبوویت؟

ئەگەر ئارامی لە بوونت نەدۆزیتەوە
لە هیچ کوێیەکی تر نایدۆزیتەوە.
(ماروین گای)

## خۆ بە کەم بینین

مەلا بۆ کڕینی پێڵاوێکی نوێ چووە شار. لای پێڵاوفرۆشان جۆرەها پێڵاوی نوێ هەبوون کە ئەو دەیتووانی ئەوەیان هەڵبـژێرێت کـە دەیـەوێ. فرۆشـیارەکە تەنانـەت چەند جوتێك لە کۆگاکـەی هێنـا تـا مـەلا سەربەسـتییەکی زیـاتری بـۆ دەسـتکەوتنی پێڵاوە دڵخوازەکەی هەبێت.

مەلا پێڵاوەکانی یەك بە یەك تاقی کردەوە، بەڵام هیچ کامیانی بە دڵ نـەبوو. هـەر جوتێك کە لە پێی دەکرد کێماسییەکی تێدا دەبینییـەوە. زیـاتر لـە دە جـوت پـێڵاو لەبەردەم مەلادا کەڵەکە ببوون و فرۆشـیارەکە بـە دان بەخۆداگرتنـەوە لـە کارەکـەی بەردەوام بوو. مەلا خەریك بوو لە کڕینی پێڵاوەکە نائومێد دەبوو کە لـەناکاو جوتێـك پێڵاوی جوانی بینی. ئەوانی لـەپێ کـرد. سـەیری کـرد پێڵاوەکـان رێـك بـە قـەبارەی پێیەکانیەتی. چەند هەنگاوێك لەناو دوکانە هات و چوو و هەستی بە ئاسودەیی کـرد. دواجار بڕیاری خۆیدا. دەیزانی دەبێ ئەم پێڵاوانە بکڕێ.

لە فرۆشیارەکەی پرسی: (نرخی ئەم پێڵاوانە چەندە؟)

فرۆشیارەکە لە وەڵامدا وتی: (ئەم پێڵاوانە، نرخیان نییە). مەلا وتـی: (چۆن شـتی وا دەبێت. گاڵتەم پێدەکەیت؟) فرۆشیارەکە وتی: (هەرگیز، بە راسـتی ئـەم پێڵاوانـە نرخیـان نییـە، چـونکە پێڵاوەکـانی خـۆتن ك لـەکاتی هاتنـە نـاو دوکانەکـە لـە پێتدابوون...

سەرنج: ئەمە چیرۆکی زۆربەی ئێمەومانانە. هەمیشە سەرنجمان لەسەر دنیای دەرەوەیە. ئایدیاڵ و جوانییەکان لە دنیای دەرەوەدا سۆراخ دەکەین. بەختەوەری و ئارامیمان لەوانیتر دەوێ. وا دەزانین مریشبکەکەی دراوسێ قازە...خۆ بە کەم زانین و زۆرجار خۆنەبینین دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ خۆی بەهەند وەرنەگرێت و هیچ سەنگێك بۆ خۆی دانەنێت.

**باڵندەیەك لەسەر شاخێك هەڵنیشت و فڕی**

**بۆ ئەو شاخە چ زیاد بوو و چی کەم بوو؟**

**من ئەو باڵندەیەم و ئەم جیهانەش شاخی منە**

**کە ڕۆیشتم لەم جیهانە چ خەمێك پەیدا دەبێ**

**مەتەڵ:**

دایکی تۆ منداڵێك دێنێتە دنیاوە. ئەو منداڵە نە برا و نە خوشکی تۆیە. ئەو کێیە؟

**وەڵام:** ئەو منداڵە تۆیت.

خۆمان وەڵامی هەموو پرسیارەکانین. ئەوەی کە بەدوایدا دەگەڕێین ، خۆمانین. بەختەوەری ڕێك لەو شوێنەدایە کە ئێمە تیایدا وەستاوین.

**زۆرێك لە خەڵكی بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێن، وەکو ئەوەی کە کڵاوەکە لەسەریان بێت و بەدوایدا بگەڕێن.**

مەلا بانگی کوڕەکەی کرد و وتی: (بڕۆ لای دراوسێکەمان قەندشکێن بێنە و وەرەوە)

کوڕەکە ڕۆیشت و گەڕایەوە و وتی: (نامدەنێ...)

مەلا وتی: (دەبووایە تکات بکردایە). کوڕەکەی وتی: (تکام کرد نەیاندامێ).

مەلا هێشتا کوڕەکەی سەرزەنشت دەکرد: (بپاڕێتایەوە). کوڕەکە وتی: (پاڕامەوە نەیاندامێ). مەلا کە دەستەوستان ببوو، وتی: (بەخوا خەڵکێکی پیسکەن! بڕۆ قەندشکێنەکەی خۆیمان لەناو کۆگاکە دەربێنە!...)

بۆچی ئەو شتانەی کە خۆمان هەمانە لەوانیتر دەرۆزەی دەکەین. بەنرخ، بەتوانا و مەزنین، بەڵام هەموو ئەمانە لەوانیتر داوا دەکەین.

هەر کەسێك لێمان بپرسێت ئایا تۆ نیازمەند و دەرۆزەکەریت؟ بە توندی وەڵامی دەدەینەوە، بەڵام راستییەکە ئەوەیە کە ئێمە هەموو رۆژێك خەریکی دەرۆزەی سۆز، سەرنج و هاندانی ئەوانیترین. تاکە جیاوازیی ئێمە لەگەڵ دەرۆزەکەر ئەوەیە کە ئەو نیەتی و داوا دەکات و ئێمە هەمانە و داوا دەکەین.

با عەشق و بایەخدانی ئەوانیتر قبوڵ بکەین و خۆشی لێ ببینین، بەڵام هیچ کاتێك لەپێناو راکێشانی سەرنج و ستایشی ئەوانیتر هیچ نەکەین.

مەزنایەتی هێز، هەمووان ناچاری ستایش دەکات، بەڵام هێز قەت بۆ راکێشانی سەرنجی ئەوانیتر هیچ ناکات.

**داواکردنی ستایش لە دەرەوەی خۆتەوە، واتە ئەوەی کە شادیت بخەیتە دەستی ئەویتر.**

**(کلۆدیۆس کلۆدیانۆس)**

کەسی بێ کەسان بە.

(دایکە تێرێزا)

## پاڵەوانی ژیانی کەسێك بە

...ڕۆژێکیان مەلا لە دەرەوەی شار پیاسەی دەکرد لەکاتێکدا کە پێی وابوو مردووە. ڕاکشا و ماوەیەك چاوەڕێ بوو. بەڵام کەس نەهات تەرمەکەی هەڵگرێت. برسێتی فشاری بۆ هێنا، هەڵسا و هاتەوە ماڵەوە و بە ژنەکەی وت من مردووم و لەو شوێنە کۆچی دواییم کردووە، پاشان گەڕایەوە شوێنی مردنی.

ژنی مەلا بە بیستنی ئەم هەواڵە دەستیکرد بە گریان و قژەکانی ڕنی. هاوسێکان کۆ بوونەوە و لە هۆکاری گریانەکەیان پرسی. ئەو وتی: (مەلا لە بیابان مردووە و لاشەکەی لەسەر زەوی ماوەتەوە).

دراوسێکان خەمبار بوون و لە شوێن و کاتی مردنەکەیان پرسی. ژنەکە وتی: (مەلای بێچارە لەبەرئەوەی کەسی نەبوو و غەریب بوو، خۆی هاتەوە ماڵەوە و هەواڵی مردنەکەی گەیاند و پاشان چووەوە شوێنی مردنەکەی).

سەرنج: (لاوازی) هەست بە تەنیایی، بێ کەسی و دڵتەنگی دەکات. هەمیشە چاوەڕوانی کەسێکە پشتیوانی لێ بکات و سۆز و نەرمی بەرانبەر بنوێنێت. هەمیشە چاوەڕوانی ڕزگارکەر و فریادڕەسێکە.

## هەستی بێ کەسی و سۆزخوازی

...هەموویان دەیانزانی کە مەلا زۆر نەخۆشە. رۆژێکیان لە حەوشەی ماڵەکەیدا خەریکی پیاسە بوو کە ژنەکانی دراوسێی هاتنە دیدەنی. مەلا دەستبەجێ رۆیشت و لەسەر پێخەفەکە راکشا. ژنەکان هاتن و پرسیاریان کرد:

(زمانمان لاڵ بێت، ئەگەر تۆ گیانت سپارد ئێمە چی بکەین؟)

مەلا وتی: (وتی ئێوە هەر ئەوەندەی کە دەتووانن بگرین).

هەمیشە تابلۆیەکی نادیار بە گەردنی لاوازییەوە هەڵواسراوە، کە لێی نوسراوە:

## کەس منی خۆش ناوێت!

کەسێك کە دەرۆزە بۆ خۆشەویستی دەکات مەبەستیەتی هەستی بەزەیی ئەوانیتر بجزوێنێت. حەز دەکات ئەوانیتر دڵیان پێی بسوتێت. ئەو خۆی بە کەسێك هەژمار ناکات و ئەم خۆ بە بچوك زانینەش هەستی تەنیایی و بێ کەسی دەهێنێتە کایەوە:

> **خوایە گیان، کە وێنەی منت دەکێشا، جوان وێنەت کێشام. بەشێوەیەکی تەندروست منت کێشا، سوپاست ئەکەم بەڵام بۆچی بە تاك و تەنیا وێنەت کێشام!**
>
> *(ناڵەناڵەکانی منالێك)*

بەڵام هێز قەت هەستێکی وای نییە. ئەو دەزانێت تەنانەت ئەگەر یەك کەسیش پەیدا ببێت کە گرنگی پێ بدات و رێزی لێ بگرێت، بەڵگە نییە بۆ ناشایستە بوونی. ئەو نەك تەنیا هەست بە بێ کەسی و تەنیایی ناکات بەڵکو بەردەوام بیر لەوە دەکاتەوە کە سەرپەنای بێ پەناکان، رزگارکەری نیازمەندان و کەسی بێ کەسان بێت.

لەوەی کە ئەوانیتر لەبارەی تۆوە
بیری لیّ دەکەنەوە نیگەران مەبە.
ئەوانیش نیگەرانی ئەوەن ئاخۆ تۆ
چۆن لەبارەیانەوە بیر دەکەیتەوە.

## نەخۆشیی حەق بەخشین بە هەمووان

دەگێڕینەوە دوو سکاڵاکەر چوونە لای مەلا نەسرەدین. سکاڵاکەری یەکەمیان وتی: (من پارەم لای فلاّن کەس هەیە نامداتەوە. دەڵێت باخەڵم بەتاڵە. ئەم قسەیەی بەجیّ نییە).

مەلا وتی: (تۆ حەقتە).

سکاڵاکەری دووەم وتی: (قەرزی فلاّن کەسم لایە بەلاّم نیمە بێدەمیّ، مایەپوچم. ئەو پیاوە منی خستووەتە ژێر فشارەوە).

مەلا لە وەلاّمدا وتی: (تۆش حەقتە!)

شاگردەکەی مەلا کە ئاگاداری ئەو گفتوگۆیە بوو وتی: (مەلا تۆ چۆن هەم بە قەرز لەسەر و هەم بە قەرزارەکەت وت حەقتە).

مەلا وتی: (تۆش حەقتە!)

**لەسەرنج**: لاوازی حەز دەکات خۆشیان بوێت، بۆیە دەبیّ خۆشەویست بێت. باشترین ڕێگا ئەمەیە: بەو شێوەیە بێت کە ئەوانیتر دەیانەوێت. دەبیّ بەو شێوەیە رەفتار بکات کە هیچ کەسێك نەڕەنجێت، دەبیّ دڵی هەموویان رازی بکات، دەبێت بە ئاوازی هەمووان سەما بکات.

لاوازی زۆر لەوە دەترسێت ئاخۆ ئەوانیتر چۆن حوکمی لەسەر ئەدەن، باکی بە ئارەزووەکانی خۆی نییە، بەڵکو ئەیەویّ بزانێت ئەوانیتر چ چاوەڕوانییەکیان لێی

هەیە. ئەو لەبەرئەوەی ئەوانیتری خۆش دەوێت لە خۆی بـەرزتر و باشـتر نایانبینێـت بەڵکو ناکامی و بێ دەسەڵاتی ناچاری دەکات. ئەو دەیەوێت مرۆڤێك بێت کە ئەوانیتر پەسەندی بکەن. بۆیە بەجۆرێك بە رێگەدا دەڕوات کە ئـەوانیتر نارەحـەت نـەبن، ئـەو شتە دەخوات کە ئـەوانیتر دەیانـەوێ، جلێـك لەبـەر دەکـات کـە ئـەوانیتر بەلایانـەوە پەسەندە، ئەو قسانە دەکات کە ئەوانیتر پێیان قبوڵە...

شـازادە ئـەمیری ئـەعزەم، کـوڕی وجیـە اللە مـیرزای سوپاسـالار، غـوڵامێکی رەشپێستی هەبوو. رۆژێکیـان بـینی ئـەگریا. لـە هۆکارەکـەی پرسـی: رەشپێسـتەکە رەتی کردەوە. پاش پێداگرییەکی زۆر وتی: (عاشقم!)

ئەمیر وتی: (عاشقی کێ؟)

رەشپێستەکە دوای بیرکردنەوەیـەکی زۆر وتـی: (هـەر کەسـێك کـە تـۆ پێـت بـاش بێت).

لەو شوێنەدا کە نۆرەی لاوازییە تـا دیـد و بیروبـاوەڕی خـۆی دەربـڕێـت، هەمیشـە ئەمەی لێ دەبیستین: (ئەوەی کە تۆ بەلاتەوە باش بێت)، (هەرچـییەك تـۆ بیڵێیـت)، (قسە، قسەی تۆیە) و (ئارەزووی تۆیە).

لاوازی نایەوێت خاتری کەس پەرێشان بکات.

**دەمی کوژران ئاهێك ناکێشم لەوە دەترسم**

**ئاوێنەی شمشێری تۆ هەڵم بگرێت**

بۆیە هیچ کاتێك ناڵێت (نا). رەخنە ناگرێت، راستەوخۆ و راشـکاوانە قسـە ناکـات. لاوازی، نـەك لەسـەر بنـەمای واقیـع بەڵکـە بـە گـوێرەی دڵخـوازیی رەفتـار ئـەکات. گەورەترین نیگەرانیی ئەوا (قبوڵبوون)ە. ئەم شێوازی ژیانەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە لاوازیـی شوناسـی خـۆی لەدەسـت بـدات. ئـەو دەبێتـە ئـامرازێکی دڵخۆشـکردنی ئەوانیتر. لە کۆتاییشدا ئەو شتەی کە ئەزمووی دەکات، هەستی قوربانییەکە.

به ئاشكرا دەدوێم و لە قسەی خۆم ئاسودەم...

(حافز)

## راشكاویی قسەكردن

...مەلا نەسرەدینیان بۆ نانی ئێوارە بانگ كردبوو. كاتێك بینی خانەخوێ هیچ پەلەی بۆ هێنانی خواردن نییە و هیچ قسە ناكات، ئۆقرەی لەبەر بڕا و دەستیكرد بە باوێشك دان.

خانەخوێ پرسی: (جەنابی مەلا! چ شتێك بووەتە هۆی ئەوەی كە دەم دادڕینتان؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (برسێتی و بێ خەوی، بەڵام ئەمەش بڵێم كە من بەهیچ شێوەیەك كەم خەویم نییە و هەر ئەم دوای نیوەڕۆیە زۆر خەوتووم).

سەرنج: لاوازی ناتوانێت بە ئاسودەیی قسەی دڵی خۆی بكات، بۆچوونی خۆی بڵێت، ئەگەر رەخنەیەكی هەبێت بە روونی بیڵێت و ئەگەر هەڵە تێگەیشتنێك بەدی بكات بیڵێت. لاوازی بۆ دەربڕینی مەبەستەكەی ئازار دەچێژێت. ئەو هەمیشە دەكەوێتە تەتەڵە، پاروەكە دەهێنێ و دەبات. نیگەرانی پەرچەكرداری بەرانبەر یان ئەوانیترە و لە كۆتاییدا قسەكەی بەو هەموو سەرەتاتكێ و هێنان و بردنە كاوێژ دەكاتەوە.

بەڵام هێز راشكاوە. بێ پەردە و راستگۆیانە هەست و بۆچوونی خۆی بەیان دەكات. هێز كاتێك ناڕوونی و تەمومژ دەبینێت، بە ئاشكرا بەهەموانی دەڵێت.

...شەوێكیان ژنی مەلا پێی وت ئیتر كوڕەكەیان گەورە بووە و كاتی ژنهێنانی هاتووە. بەڵام مەلا پاساوی بارودۆخی خراپی داراییەكەیان هێنایەوە. ژنی مەلا

پێشنیاری ئەوەی کرد کە بۆ خەرجیی ژن گواستنەوەی کوڕەکەیان، کەرەکەیان بفرۆشن. مەلا و ژنەکەی بۆ ماوەیەك لەم بارەیەوە مشتومڕیان کرد و لە کۆتاییدا بابەتەکە بە تەواوی گۆڕا و بە لایەکی تردا شکایەوە.

کوڕی مەلا کە تاوەکو ئەو کاتە لەژێر لێفەوە بە وردی گوێی لە قسەکانی باوك و دایکی دەگرت، بۆئەوەی باسەکە بگەڕێنێتەوە سەر بابەتە دڵخوازەکەی (واتە هاوسەرگیری)، سەری لەژێر لێفەکە دەرهێنا و وتی: (باوکە بۆچی قسەکە ناکەیت، باسی کەرەکە بکە!)

بە ئاماژە و شیفرە قسەکردن، سکاڵا و گلەیی کردن، نیشانەی لاوازی و ڕێز لە خۆنەگرتنە. هێز، واتە خۆئامرازی. دەربڕینی ڕاستگۆیانە و ڕوونی بیروباوەڕەکان، هەستەکان، دید و بۆچوونەکان.

ئەگەر ژنت دەوێ بیڵێ.

ئەگەر ڕەخنەیەکت هەیە ئاراستەی بکە.

ئەگەر پرسیارێکت هەیە بپرسە.

ئەگەر حەزت لە شتێك نییە بیڵێ.

خۆتت خۆش بوێت و ڕێز لە خۆت بگرە.

## ستراتیژی

...مەلا لە منالّیدا هاوپۆلی کوڕی حاکم بوو. لە راستیدا حاکم بڕیاریدابوو کوڕەکەی بنێرێتە مەکتەبی مالّ بۆئەوەی ئاگاداری دەنگ و باسی رۆژ و تێکەلّی خەلّك بێت.

رۆژێکیان مەلا شەقێکی توندی لە کوڕی حاکم هەلّدا و لە بەردەم ئەوانیتردا ریسوای کرد. کوڕی حاکم کە چاوەڕێی رەفتارێکی وەهای نەدەکرد، لای خاوەنی مەکتەبەکە سکالاّی کرد. خاوەن مەکتەبەکە بە سەرسوڕمانەوە لە مەلای پرسی:

(کوڕی باش، بۆچی ئەوەت کرد؟ ئەی نازانیت ئەم شازادەیە لە ئایندەدا دەبێت جێنشینی حاکم؟)

مەلا لە وەلاّمدا وتی: (بۆچی، باشیش دەزانم. لەبەر ئەوە شەقم تێی هەلّدا کە دوایی کە بوو بە حاکم بە هەمووان دەلّێم شەقێکم لە حاکم هەلّداوە!)

سەرنج: لاوازی، بەهۆی خۆ بە کەم بینین دەیەوێ سەنگ و پێگەیەك بۆ خۆی بەدەست بێنێت و یەکێك لەم رێگایانە، خۆدانەپالّ ئەوانیترە کە ئەو پێی وایە (کەس)ن.

من هەر ئەو کەسەم کە لە منالّیدا شەقم لە حاکم هەلّداوە.

من هەر ئەو کەسەم کە لەگەلّ فلاّن کەس وێنەی یادگاریم گرتووە.

من هەر ئەو کەسەم کە باوکم فلاّنەیە.

من هەر ئەو کەسەم کە کوڕەخالّی دراوسێکەمان کوڕە مامی فلاّن کەسە.

من هەر ئەو کەسەم کە وەکو فلان جل لەبەر دەکەم، بە ڕێگەدا دەڕۆم و ئارایشت دەکەم.

من هەر ئەو کەسەم کە وێنەی فلان کەسم لە دیوار داوە.

من هەر ئەو کەسەم کە دەڵێن لە فلان کەس ئەچێت.

من هەر ئەو کەسەم کە فلان کەس واژۆی یادگاری بۆ کردووم.

من هەر ئەو کەسەم کە لەگەڵ فلان کەس خەڵکی گەڕەکێك و هاوشاری یەکترین.

من هەر ئەو کەسەم کە

هەر جۆرە هەوڵێك بۆ خۆدانەپاڵ ئەوانەی کە لە ئێمە باشترن، نیشانەی سوکی، خۆبەکەم زانین و خۆدۆڕاندنە.

**ئاوێنەی جەوهەری خودی خۆت بە**

**خاك بەسەر ئەوەی بە ناوی باوکییەوە زیندوو بوو**

**(سایب تەبریزی)**

**هەر کەسێك بە باوکی خۆیەوە شانازی بکات، هاواری لاوازی و سوکی خۆی کردووە.**

لە سەروەختی زەماوەندی نەسروڵا میرزای کوڕی نادرشا لەگەڵ کچی محەمەدشا گورکانی، بە پەیڕەوی لە ڕێبازی هاوسەرگیریی بنەماڵەی شاهانە ناوی حەوت پشتی بوك و زاوایان پرسی. وەزیر محەمەدشا، ناوی باوك و باپیرانی منداڵەکەی لە نەسروڵا میرزا پرسی.

نادرشا کە لەم پرسیارە پەست ببوو، سەرنجێکی توندی گرتە وەزیر و وتی: (بنووسە نەسروڵا کوڕی نادر، نادر کوڕی شمشێر، نادر نەوەی شمشێر و حەوت پشتی نەسروڵا لە شمشێرە و دەگاتە شمشێر).

**گرنگ نییە باپیرەم کێ بووە، دەمەوێ بزانم نەوەکەی کێ دەبێت.**

لە هەر سەردەمێکدا کەسانی بەهێز و خاوەن کاریگەری دەژین. لەبری ئەوەی کە خۆمان بدەینە پاڵ خاوەن پایە و مەزنەکان، بەشێوازێك ژیان بەسەر ببەین کە مایەی شانازیی وەچەکانمان بین.

دەڵێن: سەروەختێك کە حەزرەتی یوسف (د.خ) بۆ فرۆشتن بردیانە بازاڕی کۆیلەفرۆشان، ریزێکی درێژ لە کڕیاران پێکهاتبوو. پیرەژنێکیش بەکەڵەشێرێك لە ژێر باڵیدا لە ریزەکەدا بوو. لێیان پرسی بە کام دارایییە دەتەوێ یوسف بکڕیت. لە وەڵامدا وتی: (هەر ئەوەندەی کە ناوم لە ریزی کڕیارانی یوسفدا بێت بەسە).

**کڕیار مەبە، قابیلی کڕین بە**

**تەماشاکەری ئەوانیتر مەبە، تەماشاکراو بە**

**گوێ مەگرە، با گوێت لێ بگیردرێت**

چونکە تۆ هەر ئەو شتانەیت کە خوازیاری کڕین، بینین و بیستنیانیت. تۆ ئەو مەزنایەتی و جوانییەی کە لە دەرەوەی خۆتدا بەدوایدا دەگەڕێیت.

**حەسەن بەسری کۆمەڵێکی بینی کە لە دەوری تەرمی یەکێك لە خزم و کەسیان کۆ بوونەتەوە. وتی: بۆچی لە دەوری ئەم تەرمە کۆ بوونەتەوە. کار و کردەوەتان وەکو ئەو لێ بکەن تا وەکو ئەو بن.**

بـەمۆدێلکردنی بیروبـاوەڕی ئـەوانیتر لـە
ژیاندا شتێك لە کۆیلایەتی زیاتر نییە.
(لاڤانا بلاك وڵ)

## خۆدۆڕاندن

...ڕۆژێکیان کاتێك مەلا دەچووە شار، لە ناوەڕاستی ڕێگەدا لایدایە ئاشـێك. کـاتی خەو بە ئاشەوانەکەی وت: (سەروبەندی سپێدە بانگم بکە تا بکەمەوە ڕێ).

ئاشەوان هەر بۆ گاڵتـە کـڵاوی مـەلای لابـرد و کـڵاوی خـۆی لەسـەر سـەری دانـا و سەروبەندی سپێدە هەڵیساند.

مەلا کەوتە ڕێ. دوای ئەوەی کەمێك بە ڕێگادا ڕۆیشت ئاسمان ڕووناك بووەوە. لـە کەناری ڕووبارێك وەستا تا پشوویەك بدات. سەیرێکی ئاوەکەی کرد، بـۆی دەرکـەوت کڵاوی ئاشەوانەکەی لەسەرە. لەبەر خۆیەوە وتی: (ئاشەوانی دەبەنگ! مـن پـێم وت هەڵمسێنە لە خەو، کەچی خۆی لە خەو هەڵساندووە).

سەرنج: بە گەمژەیی مەلا پێدەکەنین کە خۆی لەگەڵ کەسێکی تردا لێ تێکچووە. وێنای ئەوە دەکەین کە دەشێ مرۆڤ دوو کەسی لێ تێك تێکەڵ ببێـت. بـەڵام هـەرگیز خۆی لەگەڵ کەسێکی تردا لـێ تێـك ناچـێت. بـەڵام ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە کـە نابێـت خۆمان زۆر لە خۆمان دڵنیا بینز دەشێ ئەوەی کە بە (خۆمان)ی دەزانین، بە ڕاسـتی خۆمان نەبین. گـرنگترین پرسـیار کـە دەبـێ مـرۆڤ بەدرێـژایی ژیـانی لـە خـۆی بکـات ئەمەیە: (ئایا من خۆمم؟)

لەوانەیە ئەم پرسە زۆر حاشاهەڵنەگر دیار بێت و لەبەر خۆتەوە بڵێیت: (مـن، مـنم نەك کەسێکی تر)، بەڵام ڕاستیی تاڵی ژیانی ئێمە ئەوەیە کە ئێمە خۆمان نـین. ئێمـە

ئەو کەسە نین کە دەبێ ببین. ئێمە ئەو کەسەین کە پێمان وایە. ئێمە ئەو کەسەین کە ئەوانیتر پێیان وتووین. ئێمە بیروباوەڕێکمان هەیە کە بە لێکۆڵینەوە و تێڕامان پێیان نەگەیشتووین، بەڵکو ئەو شتانەن کە بە قەرز لەوانیتر وەرمانگرتوون.

## لە لاساییکەرەوەوە تا بەدیهێنەر جیاوازی زۆر هەیە

**(مەولەوی)**

بە ژیری و ئەزموونی ئەوانیتر دەژین. کەواتە ئێمە خۆمان نین، ئەوانیترین. خۆ بەکەم بینین دەبێتە هۆی ئەوەیە کە هێزی خۆمان بۆ گەیشتن بە راستی و دۆزینەوەی وەلامی گونجاو بۆ پرسیارە گرنگەکانی ژیانمان پشتگوێ بخەین.

لەبەر خۆمەوە بیر دەکەمەوە و دەڵێم من چ کەسێك بم تا بگەمە راستی؟ ئەی ئەگەر ئەوانیتر بە هەڵە بیر بکەنەوە و من بە شێوەیەکی هەڵە بیرم کردبێتەوە؟ سەرەنجام ئەوەی کە لە ئێمە دەبیسترێت دووبارەبووەوەی توتی ئاسای بیروباوەڕی ئەوانیترە، وەکو ئەو شاخەی کە ئەوەی دەیڵێت دەنگدانەوەی دەنگی کەسێکە کە لەو ناوە هاوار دەکات.

برِوانە چـــــاوی خـۆت چاوت هـــەیە
مەڕوانە چاوی دەبەنگ کە بێ ئاگایە
گـوێت هەیە گویَ لـــــە خۆت بگرە
بۆچـــــی گویَ رادێری لە گەمــــــژە

(مەولەوی)

## لەخۆنامۆبوون

-مەلا نەسرەدین پێڵاوەکانی بۆ چاککردن بردە لای پینەچیی گونـد. لەبەرئـەوەی پینەچـییەکە خـەریکی داخسـتنی دوکـان بـوو بـە مـەلای وت: (سـبەی وەرە بـۆ وەرگرتنەوەی پێڵاوەکانت).

مەلا نەسرەدین وتی: (بەلاَم من پێڵاوی ترم نین تا سبەی لە پێیان بکەم).

پینەچییە شانەکانی هەڵتەکاندن و وتی: (مـن حـەقم نییـە، بـەلاَم دەتـووانم جوتـە پێڵاوێکی بەکارهاتووت بدەمیَ تا بەیانی).

مەلا هـاواری کـرد و وتـی: (چـی؟ تـۆ دەتـەویَ پێڵاوێـك لـە پـیَ بکـەم کـە پێشـتر کەسێکی تری لە پێی کردوون؟)

پینەچی بە ساردییەوە وەلاَمی دایەوە: (سەپاندنی بیروباوەڕی ئەوانیتر نارەحەتت ناکەن، بەلاَم لەپێکردنی پێڵاوی کەسێکی تر و سەپاندنی بەسـەر پێیەکانتـدا ئـازارت دەدات؟)

ستایش بکــەن، بەڵام ئیرەیی مـــەبەن

ســـــۆراخ بکەن، بەڵام لاسایی مەکەنەوە

## لاساییکردنەوە

وەستایەك لەسەر بانی گڵی ماڵی مەلا کای دەڕشت. کاتێك کارەکـەی تـەواو بـوو ویسـتی بێتـە خـوارەوە رێگـا نـەبوو، وتـی: (چـی بکـەم بۆئـەوەی بـێ گرفـت بێمـە خوارەوە؟)

مـــەلا وتـــی: (پـــەتێك هەڵدەدەمـــە ســـەرەوە. لـــە کەمـــەرتی ببالێنـــە تـــا بتهێنمـــە خوارەوە).

هەر کە پەتەکە لە کەمەری وەستا توند بوو، مەلا و چەند هاوڕێیەکی وەسـتاکەیان راکێشا و نەگبەتە بەر بووەوە خوارەوە و گیانی لەدەستدا.

خەڵکی مەلایان سەرزەنشت کرد و وتیان ئەمە کەی هێنانە خوارەوەیە؟!

وتی: (باوکم هەمیشە بـەم شـێوەیە خـەڵکی لـە بـیر دەهێنایـە دەرەوە. پـەتی لـە کەمـەریان دەبەسـت و رایدەکێشـان. لەوانەیـە ئـەم پیـاوە ئەجـەلی هاتبێـت ئـەگینا نەدەمرد).

**سەرنج:** چـیرۆکێك لـەبارەی چـارلی چـاپلنی ئەکتـەری کۆمیـدیی سـینەماوە هەیە...رۆژێکیان رایانگەیاند هەر کەسێك بەشێوەیەکی باشتر رۆڵـی (چـارلی چـاپلن) بگێڕێت خەڵاتێك وەردەگرێت. بە رێکەوت خودی چارلیش لەم پێشبڕکێیەدا بەشداری کرد و سێیەم بوو.

لــە لاســاییکردنەوەی ئــەوانیتر و لێکچــوون لەگــەڵ ئــەوانیتردا، لــەوان باشــتر دەردەکەوین.

نەبوونی بڕوابەخۆبوون دەبێتە هۆی ئەوەی کە شێوازی کوێرانەی لاسایی ئـەوانیتر بگرینە بەر. کەسێك بەم جۆرە بیر دەکاتەوە کە رێز بۆ خۆی دانـانێ ئـەگینا مرۆڤێـك کە رێز بۆ خۆی دابنێ رێگە نادات بە خۆی لاسایی رەفتاری ئەوانیتر بکاتەوە و ببێتە گاڵتەجاڕی ئەم و ئەو.

**هەموو پۆزش هێنانەوەکان لەبەر ئەم رستە نە[redacted]:**

**(ئەوان ئەم کارەیان کرد بۆیە منیش کردم)**

**(ئارتور گیتومەن)**

قسەی ئەوانیتر گرنگ نییە، ئەوەی کە گرنگە
هەڵێنجانمە لە قسەکانیان.
(ماکسوێل مالتز)

## سەرنجدان لە دەم

دوو گەمژە بە رێگادا دەڕۆیشتن، یەکێکیان وتی:

(حەزم دەکرد خودا رانەمەڕێکم بداتێ کە لە هەزار سەر کەمتر نەبووایە).

ئەویتر وتی: (منیش حەزم دەکرد گەلە گورگێکی سەد سەریم هەبووایە تا هەر یەکەیان سەد سەر مەڕی تۆی هەڵبدڕیایە).

ئەوەی یەکەمیان کە مەڕی دەویست تووڕە بوو و قسەی ناشیرینی بەوەیان وت کە حەزی دەکرد گورگی هەبێ.

ئەویتریش بە قسەی ناشیرین وەڵامی دایەوە. پەیتا پەیتا کار گەیشتە دارکاری. مەلا بەوێدا رەت دەبوو. لە هۆکاری شەڕەکەی پرسی. ئەوان هەموو شتەکەیان بۆ باس کرد.

مەلا چەند گۆزەیەك هەنگوینی پێ بوو. هەموو سەرەو ژێر کرد. کە هەنگوینەکان رژانە سەر زەوی وتی: (خوێنی من وەکو ئەم هەنگوینە بڕژێت ئەگەر قسەی ناحەق بڵێم. ئێوە گەمژەترین مرۆڤی سەر رووی زەوین).

**سەرنج:** بە گەمژەیی مەلا پێ دەکەنین کە بۆچی کەوتووەتە ژێر کاریگەریی شەڕەدەمەی ئەوانیتر و بەمجۆرەتووڕە بووە. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئێمەش خۆمان رۆژانە ئەم شێوازە لە ژیانماندا دەگرینە بەر. کاتێك ئەوانیتر دەستخۆشیمان لێدەکەن و هانمان دەدەن بەرز دەبینەوە و کاتێك رەخنەمان لێدەگیردرێت دادەبەزینە خوارەوە. هەڵبەت ئەوە شتێکی سروشتییە کە مرۆڤ حەز نەکات رەخنەی

لێ بگێردرێت و تۆمەتی بێ بنەمای بخەنە پاڵ، بەڵام ئەوەی کە بە بیستنی دیدی نێگەتیڤی ئەوانیتر دەربارەی خۆی هەڵچێت و کۆنترۆڵی خۆی لە دەست بدات، شەڕانگێزی بکات و هەوڵی تۆڵەسەندن بدات، هەموو ئەمانە نیشانەی ئەو لاوازی و سوکییەیە کە لە خۆیدا هەستی پێدەکات.

**کەسێك خراپەی ئێمەی بە خەڵکی وت  ئێمە بە خراپەی ئەو ئازار ناچێژین**
**ئێمە چاکەی ئەومان بە خەڵکی وت  تا هـــەردووکمان بە درۆ دەرچین**

بەربوونەوەی بەردێکی بچوك بۆ ناو دەفرێك ئاوی بچوك هەژان دروست دەکات، بەڵام ئەگەر هەر ئەو بەردە بکەوێتە ناو دەریا، هیچ هەژان و شەپۆلێك دروست نابێت. دەریا نیشانەی ئارامی و جێگیرییە. دڵ بەدەریابوون دەبێتە هۆی ئەوەی کە هیچ شتێك شپرزە و پەرێشانمان ناکات.

**بەبێ ڕەزامەندی تۆهیچ کەسێك ناتوانێ هەستی سوکبوون لە تۆدا بێنێتە کایەوە.**
**(ئێلینۆر ڕۆزفێلت)**

چیرۆکی جیاجیا باس کراون لەبارەی شکاندن و سوکایەتی پێکردنی گەورەپیاوانی وەکو پێغەمبەر (د.خ)، عیسا (سلاوی لێ بێت) و بودا. بەڵام ئەو کاردانەوەیەی کە ئەو گەورەپیاوانە لە خۆیان پیشاندانەوە شتێك نەبووە جگە لە خۆگری و ئارامی..

هێز واتە ئارامی، ئارامی واتە مەزنایەتی. هێز تووڕە نابێت، هێز دڵ پڕ لە قین نابێت، هێز هەرگیز شپرزە نابێت. هێز لە بەرانبەر دەم شڕیدا هەست بە نائاسودەیی ناکات. دەزانێت کە بە قسەی ئەوانیتر شتێك لە بەهاکەی کەم نابێتەوە.

هێزی چاکە دەزانێت گرنگ بەڕێزبوونە نەك ڕێز لێگیران. هێز بەدوای سەلماندنی خۆیەوە نییە، بەڵام لاوازی دەیەوێت ڕێزی ئەوانیتری هەبێ، چ ئەوەی بەڕێز بێت یان نا، سەنگی خۆی لەوانیتر وەردەگرێت. لاوازی پێی وایە ئەگەر ئەوانیتر ڕێزی لێ بگرن، نیشانەی بەڕێزبوونیەتی و ئەگەر کەسێك بایەخی پێنەدات، ئەوا بێ کەڵکی و بێ نرخی ئەو سەلمێنراوە.

**نارەحەتبوون لە جۆری ڕەفتار و گفتاری ئەوانیتر بەڵگەی ئەو ڕاستییەیە کە ئێمە بەها بۆ خۆمان دانانێین و بۆچوون و ڕوانگەی ئەوانیتر دەکەینە سەرچاوەی بەهادانان بۆ خۆمان.**

لە دەزگایەکی تایبەتی کەڕ و لاڵاندا دوو کەسی هاوژوور بوو بە شەڕیان. کاتێك بەرپرسی دەزگاکە بۆ هەڵبڕینی ناکۆکییەکەیان هاتە ئەوێ، سەیری کرد یەکێکیان پشتی کردووەتە ئەویتریان و قاقا پێدەکەنێت. بەرپرسەکە بە زمانی ئاماژە پرسیاری کرد:

–چ نوکتەیەك بووەتە هۆی ئەوەی پێبکەنیت؟

بەرانبەرەکەشی بە زمانی ئاماژە وتی:

–ئەو دەیەوێت قسەم پێ بڵێت، بەڵام من سەیری ناکەم.

[illegible]: توانج و ڕەفتارە ناپەسەندەکانی ئەوانیتر مەبیستن و فەرامۆش بکەن. لە دنیایەکدا دەژین کە بەسەر ڕەفتاری ئەوانیتردا بۆ ئەو شتانەی کە ئەنجامی دەدەن

زاڵ نین. ئازادی و کۆنترۆڵمان لە چوارچێوەی بۆچوون و مۆدێلە ئەقڵیەکانماندایە. لە راستیدا هۆکاری بنچینەیی ئازارچەشتن و نارەحەتییەکانمان رەفتاری ناپەسەندی ئەوانیتر نییە بەڵکو ئەو هەستەی سوکی و بچوکییەیە کە ئێمە لە خۆماندا هەیە. کاتێك خۆمانمان قبوڵ بێت، ئیتر نیگەرانی ئەوە نین ئاخۆ پەسەندین یان نا. لەمڕۆوە لەبەرانبەر هەر رەفتارێکی نارەوادا لەسەرخۆیی خۆت بپارێزە و بیرت بێت، هەر جۆرە هەڵوێست وەرگرتن و تورەبییەك بە مانای شکانی گۆزەی هەنگوینی لەسەرخۆییە.

**ئەگەر ئەوانیتر بتوانن تورەمان بکەن، دەتوانن بەسەرماندا زاڵ بن. بۆچی دەبێت هێزێکی وەها بدەینە ئەوانیتر کە ژیانمان بخەنە ژێرکاریگەرییەوە .**

***(بنیامین کارلسن)***

له دیدی مندا سامان هەر جۆرە داهاتێکە کە لانی
کەم کەمێك لە داهاتی هاوەڵزاواکەت زۆرتر بێت!
(ئێچ ئێل مەنکن)

## چاوتێبڕین

...مەلا چووە لای هاورێکەی و وتی: (سەیرکە فلان، من زۆر دڵم پێت ئەسوتێت). پیاوەکە وتی: (بۆچی؟) مەلا وتی: (لەبەرئەوەی دوای ماوەیەکی زۆر لە شەڕ و دەمەقالێ ئەمڕۆ لەگەڵ منالەکان چووبوومە بازاڕ و هەرچییەك ویستی بۆم کڕی).

هاورێکەی وتی: (باشە ئەم شتانە چ پەیوەندییان بە منەوە هەیە؟)

مەلا وتی: (بەڵکو زۆریش پەیوەندی بە تۆوە هەیە. ئاخر کاتێك ژنەکەت بزانێ من پێڵاو و جلم بۆ منالەکان کڕیووە، ئەویش ئیرەیی دەبات و لە سۆنگەی چاوتێبڕینەوە ئەیکاتە شەڕ لەگەڵتا و تا داواکەی جێبەجێ نەکەیت، وازت لێ ناهێنێت. هەر لەبەر ئەوەشە دەڵێم پەیوەندی بە تۆشەوە هەیە).

**سەرنج:** چاوتێبڕین و ئیرەیی و رکابەری لە ئافاتەکانی خۆبەکەم زانینن. کەسێك کە هەستی زەنگینی هەیە بەپێی پێوەر و پرەنسیپەکانی خۆی دەژیت و گرنگی بەوە نادات کە ئەوانیتر دەیکەن.

بەڵام ژیانی کەسی خۆ بەکەم زان کارتێکراوە بە تێبینی و هەلومەرجی دەرەکی، لەوانەش رەفتاری ئەوانیتر. هەر هەنگاوێك کە ئەوان بینێن پەیوەندی هەیە بە کەسی خۆ بە کەم زانەوە: ئەگەر ئەوان فلان خانوو و ئۆتۆمبێلیان هەبێت، دەبێ ئەویش هەبێت.

ئەگەر ئەوانیتر بۆ پشوو بچنە فلآن شوێن، ئەویش دەبێت بچێتە ئەوێ. ئەگەر ئەوانیتر ئەم جۆرە مەراسیمی هاوسەرگیرییە ئەنجام بدەن، ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونە بگێڕن، ئەویش دەبێ کەمتەرخەمی نەکات و هەمان شت بکات. ئەگەر ئەوانیتر منداڵەکەیان ناردە فلآن قوتابخانە، دەبێ ئەویش وا بکات. ئەگەر ئەوانیتر لوتیان نەشتەرگەری کرد، ئەویش نابێ غافڵ بێت و دەبێ لوتی نەشتەرگەری بکات. وئەگەر...

ئەم لیستە کۆتایی نایەت. لە گۆڕەپانێکی وەرزشیدا بۆنموونە لە پێشبڕکێی راکردنــدا، وەرزشــکارێك بــەردەوام بــارودۆخی خــۆی لەگــەڵ راکــەرانی تــردا هەڵدەسەنگێنێت تا دۆڕاوی پێشبڕکێیەکە نەبێت.

ژیان بۆ کەسی ئیرەیی بەر پێشبڕکێیە. پێشبڕکێ بۆ (دوانەکەوتن) پێشبڕکێیەك کە دەبێ بەردەوام ئاگاداری رکابەرەکان بێت تا دوا نەکەوێت لێیان و دەبێ هەندێ کار ئەنجام بدات تا شایستەیی و هێزی خۆی بسەلمێنێت. گرنگترین ئەنجام کە ئەم شێوازەی ژیان، واتە چاوتێبڕین دەیهێنێتە کیەوە، ماڵئاوابیە لە هێمنی و شادی لە ژیان.

**هێز لەگەڵ ئەوانیتردا دۆستایەتی دەکات و لاوازیش رکابەرێتی**

## ٢
## خـــۆپـــەرســـــتی

پێیان وت: (جوامێرەکان کێن؟)

وتی: (ئەو کەسانەی کە خۆیان نابینن)

***(ئەبو عوسمان حیری)***

## خۆپەرستی

...رۆژێکیان مەلا ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت:

(کوڕی باش دەبێ گوێڕایەڵ بێت و لە هەموو شتێکدا، لەوانەش خواردن و جل و سەرگەرمی، براکەی لە پێش خۆی بدات).

کوڕی مەلا وتی: (باشە! من بەڵێن ئەدەم گوێڕایەڵ بم، بەو مەرجەی کە براکەشم بەڵێن بدات کە لە هەموو شتێکدا، خۆی لە پێش من دابنێ).

**سەرنج:** دووەمین ئەنجامی لاوازی (خۆپەرستی)یە: خۆ دانان لە پێش ئەوانیتر و تەنیا بایەخدان بە بەرژەوەندی و خواستە کەسییەکان.

بەڵام بۆچی مرۆڤ دەبێتە خۆپەرست و رەگ و ریشەی خۆپەرستی چییە؟

ئەگەر دووبارە بگەڕێینەوە سەر درامای پەرداخەکان، بیرمان دێتەوە کە پەرداخی بەتاڵ تا پڕ نەبێت هەر لە خەیاڵی دەستکەوتن و (هەبوون)دایە. پەرداخی بەتاڵ ناتوانێت بیر لە دەوروبەری خۆی و پەرداخە پڕەکانی تر بکاتەوە. مرۆڤی خۆپەرستیش بەهۆی بەتاڵی و پێویستیە مادی و سۆزییەکان ناتوانێت کەسێك جگە لە خۆی ببینێت.

مرۆڤ کاتێك گەیشتە تەواوەتی و بێ پێویستی، دەتوانێت لە خۆپەرستی دەرباز ببێت. کاتێك خواست تێر دەبێ، تەواوەتی دەست پێدەکات. لە راستیدا گرنگیدان بە مرۆڤەکانی دەوروبەر و روانین لە پێداویستی و ئازارەکان و هەوڵدان بۆ دەرککردنی ئەوانیتر، یەکەمین نیشانە و ئەنجامی تەواوەتی و هێزە.

بیری خود و بۆچوونی خود لە دنیادا هۆشیاری نییە

کفرە لەم ئایینەدا خۆپەرستی و خۆسەپاندن

*(حافز)*

# پیسکەیی

...مەلا لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە بیابان خەریکی گەشت بوو. پاش نان خواردن هاتنە کەناری گۆمێکی گەورە تا دەست و دەم و چاویان بشۆن. لەپڕ مەلا قاچی خزا و کەوتە ناو گۆماوەکەوە. هەر کەسەو لای خۆیەوە هەوڵی ئەدا رزگاری بکات. پێیان دەوت: (دەستت بدە بە من و وەرە دەرەوە). بەڵام ئەو دەستی را نەدەکێشا و خەریك بوو نقوم دەبوو. لەم سەروەختەدا یەکێك لەوانەی کە مەلای باش دەناسی، هاتە پێشەوە و وتی: (بچنە لاوە، ئێوە نازانن چۆن رزگاری بکەن، مەلا عادەتی وا نییە شتێك بدات). بۆیە بە مەلای وت: (دەستی من بگرە و وەرە دەرەوە). مەلاش دەستی هاوڕێکەی گرت و هاتە سەرەوە و لە نقومبوون رزگاری بوو.

**سەرنج:** لاواز خۆپەرستە و خۆپەرستی پیسکەیی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پیسکە تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیشی لەدەست هەڵناوەرێت. پیسکە نە سێبەری هەیە و نە میوە. لە قاموسی پیسکەدا نە خێر و نە بەرەکەت هەیە. ئەو دەستی گرتن نەك دەستی دانی هەیە.

هێز بیر لە سوودبەخشین و لاوازی بیر لە سوودوەرگرتن دەکاتەوە.

هێز ژیان وەکو دەرفەتێك دەبینێت بۆ خزمەتکردن و لاوازی ژیان وەکو دەرفەتێك بۆ چێژوەرگرتن دەبینێت.

لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوانیتردا پرسیاری هێز ئەمەیە: چۆن چۆنی دەتوانم یارمەتیدەر بم؟

(لاوازیش رێکەوتی هەر کەسێك دەکات لە خۆی دەپرسێت: چۆن دەتوانم سوود لەم کەسە وەربگرم؟)

**هێـز سـەرکەوتن لـە بەسـوودبووندا دەبینێـت و لاوازی سـەرکەوتن لـە (سوودبردن)دا دەبینێتەوە.**

...کەسێك داوای لە مەلا کرد ولاخەکەی بە قەرز پێ بـدات. وتـی: (ولاخەکـەی مـن رەشە). کابرا وتی: (بۆ، ولاخی رەش بۆ سـواربوون نابێـت؟!) مـەلا وتـی: (ئـەی بـۆ نابێت، بەلام لەبەر ئەوەی نامەوێ ولاخەکەت پێ بدەم بیانوو دەهێنمەوە).

لە شوێنێکدا وتەیەکی (گۆتە)م خوێندەوە کە دەڵێت مرۆڤە گەورەکان وەکو شـاخ دەمێننـەوە، چـەندەی لێیـان نـزیکتر بکەویتـەوە مەزنایـەتی و سـامیان زیـاتر دەردەکەوێت.

بەلام خەڵکی بێ کۆشش و دەستەوستان وەکو سەراب وان. چەندەی لێیان نزیکتر بکەویتەوە، نزمی و بچوکیان ئاشکراتر دەبێت. کەواتە هێز شاخە و لاوازی سەرابە.

**لە پیسکەیەکیان پرسی: (ئازاترین مرۆڤ کێیە؟) وتی: (ئەو کەسەی کە دەنگی کۆمەڵێك بە گوێی بگات کە خەریکی خواردنی نانەکەین و هیچ خۆی تێك نەدات).**

به دڵنیاییەوە مێردەکەی تۆ هەڵەی هەیە. ئەگەر ئەو قەدیسێك بووایە لەگەڵ تۆدا هاوسەرگیری نەدەکرد.

## ببە بە هەمان ئەو کەسە نموونەییەی کەخۆت دەتەوێ ببیت.

...مەلا نەسرەدین خەریکی گفتوگۆ بوو لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانیدا:

هاوڕێکەی وتی: (مەلا قەت بیرت لە هاوسەرگیری کردووەتەوە؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (بۆ نا، جارێکیان بیرم لێ کردەوە. لە قۆناغی گەنجێتیمدا بیرم لەوە کردەوە کە ژنێکی کامڵ بۆ خۆم بدۆزمەوە. بۆیە دەشت و بیابانەکانم بڕی و گەیشتمە شاری دیمەشق و ئاشنای ژنێك بووم کە بێ رادە باوەڕدار و جوان بوو، بەڵام هیچی لەبارەی شتەکانی ئەم دنیایەوە نەدەزانی. درێژەم بە سەفەرەکەی خۆمدا و گەیشتمە ئەسفەهان. لەوێ ژنێکم ناسی کە قەڵەمڕەوی دنیای مادی و رۆحی دەناسی، بەڵام جوان نەبوو. بۆیە بڕیارمدا بچمە شاری قاهیرە و لەوێ بوو کە لەگەڵ کچێکی جوان و دیندار و ئاگادار لە راستییەکانی ئەم جیهانە ئاشنا بووم...

هاوڕێکەی پرسی: (ئەی بۆچی هاوسەرگیریت لەگەڵ نەکرد؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (هاوڕێ، لە بەدبەختی، ئەویش بەدوای پیاوێکی کامڵدا دەگەڕا!)

**سەرنج:** خۆپەرستی دەبێتەهۆی ئەوەی کە مرۆڤ لە بیری بەدەستهێنان و خاوەندارێتی باشترینەکان بێت بۆ خۆی، بێ ئەوەی کە ئەوە لەبەرچاو بگرێت ئاخۆ ئامادەیی و لێهاتوویی ئەمەی هەیە یان نا.

ئەم پرسە بەتایبەت لە هەڵبـژاردنی هاوسـەردا بـە چـاکی دەردەکـەوێت. هـەمووان بەدوای کەسێکی دڵخوازدا وێڵن تـا بیکەنـە هـاودەمی ژیانیـان. بـەڵام کـەمتر کەسـێك پەیدا ئەبێ کە بیر لەم بابەتـە بکاتـەوە و لـە خـۆی بپرسـێت ئایا منـیش بـۆ کەسـی بەرانبەرم گونجاوم یان نا. ئێمە بیرمان چووە کە:

**سەرکەوتن لە هاوسەرێتیدا تەنیا بەوە نییـە کـە کەسـێکی گونجـاو بـۆ خۆمان بدۆزینـەوە بـەڵکو زیـاتر بەنـدە بـەوەی کـە ئێمـەش کەسـێکی گونجاو بین.**

وا باشە پرسیار لە خۆمان بکەین ئەگەر من لە شوێنی کەسی بەرانبـەرم بوومایـە و هەر ئەو زانیارییەی لەبارەی خۆمەوە هەمە لەو بارودۆخەشدا هەمبووایە، ئایا ئامـادە بووم لەگەڵ کەسێکی وەهادا هاوسەرگیری بکەم؟ چ لاوازی و کێماسـییەکم هەیـە کـە دەبێ نەیانهێڵم بۆئەوەی ببم بە هاوسەرێکی نموونەیی؟

–گەنجێك بە هاورێکەی وت:

(ئەو ژنەی کە دەمەوێ، پێویستە جوان، دەوڵەمەند و گەمژە بێت!)

هاورێکەی وتی: (جوانی و دارایی قەینا، بەڵام بۆ گەمژە بێت؟)

گەنجەکە وتی: (جوانی و داراییەکەی بۆ ئەوەیە کـە مـن لـە هاوسـەرێتیم لەگەڵیـدا ئاسودە بم و گەمژەییەکەشی بۆ ئەوەیە کـە ئـەو لـە هاوسـەرێتی لەگـەڵ منـدا خـۆی یەکلا بکاتەوە).

تێـڕوانینی خۆپەرسـتانە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە تاکەکـەس بەشـێوەیەکی تـاك ڕەهەندانە سەرنجی لە دەرەوە بێـت و گـەورەترین نیگـەرانی، هـەبوونی هاوسـەرێکی کامڵ و نموونەیی بێت، بە جۆرێك کە هەر کاتێك سەیری دەکات بڵێت:

**"ئەوەی کە باشەکان هەموویان هەیانە تۆ هەموویت هەیە."**

بەلآم تێڕوانینی بە ویژدان دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێش هەموو شتێك بڕوانێتە خۆی و لە خۆی بپرسێت: (ئایا هەموو ئەو شتەی کە لە هاوسەرێکی نموونەییدا سۆراخی دەکەم، لە خۆمدا هەمە؟)

**پۆلێك لەو تایبەتمەندییانەی کە حەز دەکەن لە هاوڕێیەکتاندا هەبێت، بنووسن و ئینجا دەست بکەن بە گەشەپێدان و بەهێزکردنی لە خۆتاندا.**

**(سۆزان جیفەرز)**

چاوچنۆکەکان چێژ لە خواردن وەردەگرن‌و
بەخشندەکان لە خۆراك پێدان.
(ئیمامی عەلی (س.خ) )

## خۆشەویستی یان خۆویستی

...مەلا لە سەفەرێکدا گەیشتە پیاوێك و لەگەڵیدا کەوتە رێ. کاتێك ئەوان لە ماڵێکدا بۆ پشوو لایاندا، پیاوەکە بە مەلای وت: (وەرە ئەم پارەیە وەرگرە و بچۆ گۆشت بکڕە). مەلا وتی: (خۆت برۆ. من زۆر ماندووم!)

پیاوەکە رۆیشت و گۆشتی کڕی و هێنای. پاشان بە مەلای وت: (کەواتە هەڵسە و گۆشت لێنێ!)

مەلا وتی: (حاڵم خۆش نییە).

پیاوەکە گۆشتی لێنا و لەپێش مەلای دانا و پێی وت: ( لانی کەم نانەکە ورد بکە!) مەلا لە وەڵامدا وتی: (بەخوا دڵم نایبات). پیاوەکە نانەکەی ورد کرد و وتی: (وەرە نانەکە بخەرە ناو گۆشتاوەکە!) مەلا وتی: (دەترسم گۆشتاو بەسەر جلەکەمدا بڕژێت پیس ببم!)

پیاوەکە خۆی نانەکەی کردە ناو گۆشتاوەکەوە. پاشان بە مەلای وت: (ئێستا وەرە نان بخۆ!)

مەلا هەڵسا، لە بەردەم سفرەکە دانیشت و وتی: (تا کەی دەتوانم بە قسەت نەکەم؟ بە خوا شەرم دەکەم سەیرت بکەم!) ئەمەی وت و دەستیکرد بە نان خواردن.

سەرنج: بەپێی گەشەی کەسایەتی لە تاکەکەسدا، چێژیشی دەگۆڕێت.

**پێم بڵێ چێژ لە چی وەردەگریت تا پێت بڵێم کێیت.**

هێز خۆشی لە بەخشین دەبینێت و لاوازی لە وەرگرتنی بەخشش

هێز خۆشی لە چاکەکردن دەبینێت و لاوازی لە بینینی چاکە

هێز خۆشی لە خۆشەویستی وەردەگرێت و لاوازی لە بینینی خۆشەویستی

هێز خۆشی لە دەرك كردن دەبینێت و لاوازی لە دەرك كران

هێز خۆشی لە خۆشویستن دەبینێت و لاوازی لە خۆشویستران

ئەمەی کە تۆ خۆشی لە چی دەبینیت، بەندە بەوەی کە لە چ رووبەرێکی ژیان (هێز یان لاوازی)دایت.

لەوەی کە دەرکت ناکەن نارەحەت مەبە،
لەوەی کە دەرك ناکەیت نارەحەت بە.
(پەندی چینی )

## چاوەڕوانیی زیادەڕەوانە

...رۆژێکیان مەلا چووە لای کوێخای گوند و داسێکی بە ئەمانەت لێوەرگرت. پاش ماوەیەك کوێخا هاتە ماڵی مەلا و چووە سۆراخی داسەکەی. بەڵام مەلا چەندەی گەڕا داسەکەی نەدۆزییەوە. کوێخا بە تووڕەیەوە وتی: (مەلا ئەگەر داسەکە نەگەڕێنیتەوە دۆستایەتیمان دەکەوێتە مەترسییەوە). مەلا وتی: (ئایا تۆ کە دەتەوێ داسەکەت وەربگریتەوە، دۆستایەتیمان ناخەیتە مەترسییەوە؟)

**سەرنج:** چاوەڕوانیی زیادەڕەوانە لە بەرانبەرەکەت، ئافات و ئەنجامی خۆپەرستییە. کەسی خۆپەرست مرۆڤێکی لەخۆڕازی و لەڕادەبەدەر چاوەڕوانە. ئەو، ئەوەندەی لەوانیتر چاوەڕێی دەکات لە خۆی چاوەڕێ ناکات. ئەو چاوەڕێی ئەوە دەکات کە هەمیشە ئەوانیتر لێبووردە بن، هەنگاوی یەکەم بنێن و لێ تێگەیشتن و دەرك و دان بەخۆداگرتنێکی زۆرتر پیشان بدەن. لاوازی، هەمیشە بە دانانی قورساییەکی زۆرەوە لەسەر شانی ئەوانیتر دێتە پێشەوە و هەمیشە تۆپەکە هەڵدەداتە گۆڕەپانی ئەوانیتر.

لەلایەکی ترەوە، هێز چاوەڕوانی لە کەس نییە. ئەو زیاتر لەوەی کە چاوەڕوانی لەوانیتر هەبێت، هەست بە بەرپرسیارێتییەکی زیاتر دەکات لەبەرانبەریاندا. لە راستیدا تاکەکەس چەندەی بەهێزتر بێت، چاوەڕوانی و پێشبینی زیاتری هەیە و

سەختیی زیاتر دەخاتە ئەستۆی خۆی نەك ئەوانیتر. لە كارە بەكۆمەڵەكاندا، زۆرێك لە بێ سەروبەرییەكان دەگەڕێتەوە بۆ كەسانی لاواز و لەڕادەبەدەر چاوەڕوان. ئەزموونێكی بەڕێوەبردن دەڵێت: (هێزی زنجیرێك یەكسانە بە ناسكترین و لاوازترین ئەڵقەی ئەو زنجیرە).

لە راستیدا كەسی خۆپەرست خاڵی لاوازی كارە بەكۆمەڵەكانە. كەم كاركردن، راكردن لە لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی، بەش خوازی و قبوڵنەكردنی هەڵە و كەم و كورییەكان، بەشێكە لەو بەرپرسیارێتییەی كە كەسی لەڕادەبەدەر چاوەڕوان لە ژینگەی كاردا دەیهێنێتەكایەوە.

**شەرەفمەند هەرچییەك بیەوێ لە خۆی دەوێت و سوك و نزمیش لەوانیتری دەوێ.**

واقیعەکان تەنیا بەوەی کە پشتگوێیان
بخەیت لەناو ناچن.
( ئەلدۆس هاکسلی )

♦

گەر ئاوێنە وێنەی تۆ بە راست پیشان بدات
خۆت بشکێنە ئاوێنە شکاندن هەڵەیە

## نا واقیعبینی

...لە مەلایان پرسی: (فلآن کەس دەناسیت؟)

وتی: (بەڵێ)

وتیان: (کەسێکی چۆنە؟)

وتی: (نیوەی باشە و نیوەی خراپ)

پرسیان: (یەعنی چی؟)

وتی: (بە چاوەکانی واقیع دەبینێت و بە پێیەکانی لێی رادەکات).

**سەرنج:** کاتێك ئەرستۆ رەخنەی لە فەلسەفە گرت، پێیان وت: (بۆچی رێزت لە مامۆستاکەت نەگرت. وتی: من مامۆستاکەمم خۆش دەوێت، بەڵام حەقیقەتم لەو زیاتر خۆش دەوێت.

هێز (حەقیقەت)ی لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت و رێزی لێ دەگرێت. ئەو خۆی لەگەڵ واقیعدا دەگونجێنێت نەك واقیع لەگەڵ خۆیدا بگونجێنێت. بەڵام کەسی خۆپەرست هیچ کاتێك ناتوانێت حەقیقەت بەو شێوەیەی کە هەیە ئەزموون بکات، چونکە هەمیشە راستییەکان لە پشت چاویلکەی خۆپەرستییەوە تەماشا دەکات.

# گرنگیدان بە خۆ ا

...مەلا لەگەڵ خەڵکی گوند کێشەی هەبوو و ڕۆژێکیان بە کینە و هەڕەشەوە گوندی جێ هێشت. کاتێك خەڵکی پرسیاریان کرد بۆچی گوند جێ دەهێڵیت، وتی:

(بەهۆی ئەو ئازار و عەزابەی ماوەیەکی زۆر پێتان گەیاندم دەڕۆم. بەلآم لە سبەینێوە دەزانن ڕۆیشتن چ مانایەکی هەیە و وانەی ژیان فێر دەبن).

دێهاتییەکان کە لە هەڕەشەی مەلا سەریان سوڕمابوو، پرسیان: (ئەو وانەیەی کە بە ئێمەی دەدەیت چیە؟)

ئەو وتی: (من ئەو کەڵەشێرە لەگەڵ خۆما دەبەم کە هەموو ڕۆژێك بە خوێندنی ڕۆژ هەڵدێت. ئەو کاتە ڕۆژ لەو گوندەی سەرەوە هەڵدێت کە من بۆی دەچم).

و ئەم چیرۆکە درێژەی هەیە ...مەلا چووە گوندەکەی سەرەوە، سەر لە بەیانی کەڵەشێرەکەی خوێندی و ڕۆژ هەلآت. مەلا لەبەر خۆیەوە وتی: (گەمژانەی گوندی خوارەوە! دەبێ وەکو هەوری بەهار فرمێسك بڕێژن، چونکە لە ئێستە بەدواوە چیتر خۆر لێرە هەڵنایەت و دەبێ ئێوە هەمیشە لە تاریکیدا بژین.

...لە مەلایان پرسی ناوەندی دنیا کوێیە. وتی: هەر لەو جێیەی کە گوڵمیخی تەویلەی کەرەکەم چەقاندووە.

**مرۆڤی خۆبین خۆی بە ناوەڕۆك و دنیاش بە پەراوێز دەزانێت.**

**ئێمە دەڵێین حەزمان لە ڕاستییە، بەلآم**

**زۆرجار ئەو شتانەی کە حەزمان لێیەتی، بە**

**ڕاستی لەقەڵەم دەدەین.**

## کلکی کەڵەشێر یان سوێندی حەزرەتی عەباس

...رۆژێکیان کەسێك هاتە لای مەلا و داوای لێکرد تا وڵاخەکەی بۆ سەعاتێك بە قەرز بداتێ. مەلا کە نەیدەویست وڵاخەکەی پێ بدات، وتی: (وڵاخەکە لێرە نییە، کورەکەم بردوویەتە بیابان).

هەر لەو ساتەدا دەنگی حیلە حیلی وڵاخەکە بەرز بووەوە. کابرای دراوسێ وتی: (خۆ تۆ وتت وڵاخەکە لە بیابانە، ئەی ئەوە کێیە حیلە حیل دەکات؟)

مەلا بە تورەییەوە وتی: (کەسێکی سەیریت. قسەی پیرەمێردێکی وەکو منت قبوڵ نییە، بەڵام باوەڕ بە حیلە حیلی وڵاخێکی بێ شعور دەکەیت؟)

سەرنج: بەرزترین ئاستی خۆپەرستی ئەوەیە کە چاوەڕێی ئەوە بکەین ئەوانیتر ئەوەی کە ئێمە دەیڵێین بە لەپێشتر بزانن لەوەی کە خۆیان لە ئێمە دەیبینن. چاوەڕێی ئەوە دەکەین کاتێك خەڵکی کلکی کەڵەشێر دەبینن، فەرامۆشی بکەن و لەبەرانبەردا باوەڕ بە سوێندی حەزرەتی عەباس بکەن:

کەسێك کەڵەشێرێکی لە ماڵێك دزی. خاوەن ماڵەکە رایکرد بەدوایدا تا پێی گەیشت و وتی: (مامە گیان! کەڵەشێرەکەمت بۆ کوێ برد؟)

ئەو کابرایە کەڵەشێرەکەی لەژێر جلەکەیدا شاردبووەوە، بەڵام نەیدەزانی کلکەکەی لەژێر کراسەکەیەوە دەرچووەو دەبینرێت. نکوڵی لە دزییەکەی کرد و دەستیکرد بە خواردنی سوێندی حەزرەتی عەباس کە ئەم کەڵەشێرەکەی نەدزیووە و ئاگاداری ئەو کەڵەشێرە نییە. خاوەن کەڵەشێرەکە ئاماژەی بە کلکی کەڵەشێرەکە کرد و وتی: (برا! بڕوا بە سوێندی حەزرەتی عەباسەکەت بکەم یان کلکی کەڵەشێرەکە...)

کاتێك مرۆڤ دەیەوێ بەورێك بکوژێت ناوی دەنێن راو و سەرگەرمی، بەڵام ئەگەر بەور بیەوێت ئەم راو بکات، پێی دەڵێن خوی درندانە.

## گرنگیدان بە خۆ ۲

...رۆژێکیان پیاوێك هاتە لای مەلا و لێی پرسی:

(ئەگەر مانگای تۆ شاخ لە مانگاکەی ئێمە بدات و برینداری بکات، حەل چیە؟)

مەلا وتی: (خۆ ئاژەڵ ئەقڵی نییە، دەبێ لێبووردە بیت).

پیاوەکە پرسی: (لەم بارەدا ئەگەر مانگاکەی ئێمە شاخی لە مانگاکەی تۆ بدات و برینداری بکات، چی ئەبێ؟)

مەلا بیرێکی کردەوە و وتی: (لەم بارەدا بابەتەکە دەگۆڕێت. دەبێت بگەڕێمەوە بۆ کتێبی یاسا).

سەرنج: گرنگترین ئەنجامی خۆپەرستی رەچاونەکردنی پرەنسیپی دادپەروەری و ویژدان و پێشێلکردنی یاسای ئاڵتونیی (ئەوەی بۆ خۆت قبوڵی دەکەیت بۆ ئەوانیتریش قبوڵی بکە).

**فەرمووی سۆفیگەری دوو شتە:**

**" یەکلا روانین و یەکسان روانین "**

**(ئەبوسەعید ئەبولخەیر)**

نیاز و حەزە کەسییەکانمان دەبێتە هۆی ئـەوەی کـە بـە یەکسـان لـەنێوان خـۆ و ئـەوانیتردا حـوکم نـەدەین و هەلومـەرج (پەیوەسـت) بـە بەرژەوەنـدی و بـارودۆخی خۆمان هەڵسەنگێنین. لە راستیدا لێکدانەوەی مەسەلەکان بەندە بە قازانج و زیانمان. من نادادپەروەرییە سەرچاوەگرتووەکانی خۆپەرستیم بە پرەنسیپی (بەنـدە بـە....) ناودێر کردووە.

یاسای بەخشین رەچاو بکرێت یان یاسای سەر بە سەر؟

بەندە بـەوەی کـە بەرژەوەندییـەکانمان چـۆن دابـین دەکرێن. ئەگـەر ئێمـە هەڵـە بکەین، دەبێ یاسای بەخشین جێبەجێ بکرێـت. بـەڵام ئەگـەر ئـەوانیتر هەڵـە بکـەن، حوکمەکە جێبەجێکردنی پرەنسیپی (سەر بە سـەر)ە. ئەگـەر مانگاکـەی ئێمـە شـاخ بهاوێ، دەبێ لێبووردە بین، بەڵام ئەگەر شاخ لە مانگاکەی ئێمە بـدەن، یاسـا دیـاری دەکات چی بکرێت. کرداری ئێمە لەسەر بنەمای واقیع و هەلومەرج و دەبێ کارەکانی ئەوانیتر لەسەر بنەمای پێوەرە نموونەییەکان هەڵبسەنگێنرێت!

> **سەروەری کارەکان، رەچاوکردنی ویژدانە لەبارەی خۆتەوە.**
>
> **فەرموودە**

## چیرۆکەکانی پەیوەندیدار بە پرەنسیپی (( بەندە بە.... ))

١-کورێك لە باوکی پرسی: جیاوازیی نێوان رەزیلی و دەست پێوەگرتن چییە؟

بـاوك لـە وەڵامـدا وتـی: جیاوازییەکـە ئەوەیـە کـە ئەگـەر مـن پـاڵتۆی دە سـاڵ لەمەوبەرم لەبەر بکەم، کەسێکی دەست پێوەگرم، بەڵام ئەگـەر بـە دایکـت بڵـێم ئـەو پاڵتۆیەی پار کڕیوویەتی ئەمساڵیش لەبەری بکات، کەسێکی رەزیلم...

٢–ئەگەر تیۆرەی ڕێژەیی من ڕاست بێت، ئەڵمانییەکان دەڵێن من ئەڵمانیم و فەرەنسییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە من جیهانیم. بەڵام ئەگەر تیۆرەکەم هەڵە دەرچێت، فەرەنسییەکان دەڵێن من ئەڵمانیم و ئەڵمانییەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە من جولەکەم!

٣–چەتەیەکی دەریاییان هێنایە لای ئەسکەندەر. ئەسکەندەر وتی: شەرم ناکەیت چەتەیی دەکەیت؟

چەتەی دەریایی لە وەڵامدا وتی: (حەقتە. لەبەرئەوەی کەشتییەکم هەیە چەتەم، بەڵام ئەگەر وەکو تۆ کەشتیی زۆرم هەبوونایە بە ڕزگارکەری وڵاتان ناو دەبرام).

**کەسێك کە پارە دەدزێت لەسێدارە دەدرێت و کەسێك کە زەوی دەدزێت دەگاتە تەختی پاشایەتی.**

**(پەندی ژاپۆنی)**

گرنگ نییە چەنێك ئەبەخشین، گرنگ ئەوەیە کە چ ئاستێك عەشق لەم بەخشینەدا هەیە.

دایکە تێرێزا

## عەشقی بێ بەند و مەرج

...کوڕی زەماوەندی یەکێك لە گەورە پیاوان بوو و مەلاشیان بانگهێشت کردبوو. کاتێك ویستی بێتە ژوورەوە، سەیری کرد دوو دەرگای لەبەردەمدایە و ئاگادارییەکی بەم شێوەیەیان پێوە هەڵواسیووە:

لەم دەرگایەوە بوك و زاوا دێنە ژوورەوە و لە دەرگاکەی ترەوە بانگهێشتکراوەکان دێنە ژوورەوە.

مەلا لە دەرگای بانگهێشتکراوەکانەوە چووە ژوورەوە. لەوێش دوو دەرگای بینی کە ئاگاداریی تریان پێوە هەڵواسرابوو: لەم دەرگایەوە ئەو بانگێهشتکراوانە دێنە ژوورەوە کە دیارییان هێناوە و لە دەرگاکەی ترەوە ئەو بانگهێشتکراوانە دێنە ژوورەوە کە دیارییان نەهێناوە. هەڵبەت مەلا لە دەرگای دووەمەوە چووە ژوورەوە. لەناکاو خۆی لەو کۆڵانەدا بینییەوە کە لێیەوە هاتبووە ژوورەوە.

**سەرنج:** ئەم چیرۆکە حیکایەتی ژیانی ئێمەیە. کەسانێك بۆ ژیانمان بانگهێشت دەکەین (پەیوەندییان لەگەڵ دروست دەکەین)، بەڵام کاتێك کە دەزانین هیچیان لێ هەڵناکرێت بۆمان، پەیوەندییەکە دەپچڕین و وێڵیان دەکەین.

پەیوەندییە سۆزییەکانمان شتێك نین جگە لە مۆدێلی زاڵ بەسەر پەیوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکاندا. واتە پەیوەندی لەسەر بنەمای جۆرێك لە بیری سەوداگەری. عەشق لەسەر بنەمای ترس و لاوازی قازانجگەرایانەیە. دەمانەوێ لەبەرانبەر ئەو شتەی کە دەیدەینە ئەوانیتر، خێرێکمان دەست بکەوێت.

**بیٚ چاوتێبڕین نەمبیستووە لە خاس و عام**

**تەنیا سەلامێکیش ئەی براکەم وەسەلام**

**(مەولەوی)**

ئەگەر خۆشەویستییەك دەربڕین، چاوەڕێی قەرەبوو دەکەین. ئەگەر سڵاوێك بکەین، دەمانەوێ گوێمان لە عەلەیکی بێت. ئەگەر هەنگاوێك هەڵێنین، دەمانەوێ لە ناو دڵی خۆیاندا جێمان بکەنەوە:

**چەند ستەمکارە ئەو کەسەی کە لە گیرفانی خۆی ئەتداتێ تا لە دڵی تۆ شتێك بسەنێ.**

**جوبران خەلیل جوبران**

خۆشویستنەکانی ئێمە قەید و مەرج، حساب و کتابیان هەیە، پەیوەندییەکانمان لەسەر بنەمای ترسن، مەرجدارن و چاوەڕوانکراون. ئەگەر کەسێکمان خۆش بوێت لەبەر ئەوەیە کە دەمانەوێت پەرداخی پێویستیمان پڕ ببێت. ئەگەر پەیوەندییەکی سوودبەخش نەبێت، درێژەی پێ نادەین:

نارەنجێم ئەگەر خو بدەیتە ئەویتر

بۆ ئێمە چیت کرد تا بیکەیت لەگەڵ ئەویتر

**تا پێش مردن تەنیا مەرگ دەتوانێت دوو دڵدار لە یەکتری جیا بکاتەوە. بەڵام پاش هاوسەرگیری تەقریبەن هەموو شتێك دەتوانێ لەیەکتریان جیا بکاتەوە.**

بەڵام عەشق لەسەر بنەمای هێزی قازانجخواز نییە و ئیش بە تەرازوو ناکات. عەشقی رەسەن بێ ریایە و بێ چاوتێبڕین و ئومێدی پاداشت و قەرەبووە. ئەو چاوەڕوانی قەرەبووکردنەوە و ستایش و پێزانین نییە. دەبەخشێت چونکە بوونی وا دەخوازێت.

هەرکاتێك خودا بیەوێت بێ ناڕەحەتکردن خێر بە بەندەیەکی بکات ئەوا هاوڕێیەکی شایستە و چاکی پێدەبەخشێت.

" فەرمودە "

## پێوەری دۆستان گزی ڕۆژی پێویستییە.

...مەلا و هاوڕێکەی لە ڕێگایەکدا پێکەوە هەنگاویان دەنا، لەناکاو مەلا کیسەیەك پارەی بینی کە لە گیرفانی کەسێك بەر ببووەوە. هاواری کرد: (سەیرکە چیم دۆزییەوە، چەند قورسە! دەبێ پڕ بێت لە پارە. ئینجا بە خێرایی کیسەکەی کردەوە، بەڵام کاتێك بینی کیسەکە پڕە لە سکەی ئاڵتون وتی: (ئای چەند بەختەوەرم!)

هاوڕێی مەلا وتی: (دەبێ بڵێیت ئێمە چەنێك بەختەوەرین، ئەی ئێمە پێکەوە نەبووین؟ دەبێ ڕێبواران لە خۆشی و ناخۆشیدا هاوبەش بن).

مەلا لە وەڵامدا وتی: (نە هیچ وا نییە. من پارەکانم دۆزییەوە و مەبەستمە بۆ خۆم هەڵیانگرم).

هێشتا ئەو ڕستەیەی بە تەواوی دەرنەبڕیبوو کە هەردووکیان گوێیان لە دەنگێك بوو دەیگوت: (دەبووایە...دزەکە....دەبووایە) مەلا و هاوڕێکەی ئاوڕیان دایەوە. چەند کەسێکیان بینی کە بەرەو ڕوویان دەهاتن و هەردووکیشیان تێلایان بە دەستەوە بوو.

مەلا کە کیسە پارەکەی توند بە دەستیەوە گرتبوو و ڕەنگی بزرکابوو بە هاوڕێکەی وت: (ئەگەر پارەکانمان بە دەستەوە ببینن بەدبەخت دەبین. پێیان وایە ئەم کیسەیەمان دزیووە).

لەم ساتەدا هاوڕێی مەلا بە ساردییەوە وتی: (مەڵێ بەدبەخت دەبین، پێش هاتنی ئەم پیاوە نەتدەگوت (ئێمە)، بۆیە ئێستاش بڵێ (من) بەدبەخت دەبم).

**سەرنج:** ئەگەر لە بەختەوەریدا لەگەڵ ئەوانیتر هاوبەش نەبیت، چاوەڕێی ئەوە مەبە لە بەدبەختیدا لەگەڵتدا هاوبەش بین.

## چیرۆکێکی شبلی

*ڕۆژێکیان کۆمەڵێك چوونە لای شبلی و ئەو بەند کرابوو.*

*پرسی: (ئێوە کێن؟)*

*وتیان: (هاوڕێیانی تۆ)*

*بەردی تێگرتن، بۆیە هەموویان ڕایانکرد.*

*وتی: ئەی درۆزنینە! هاوڕێیان بە تێگرتنی چەند بەردێك لە بەر هاوڕێی خۆیان ڕادەکەن؟*

*دەرکەوت هاوڕێی خۆتانن نەك هی من.*

لەبارەی دەرد بدوێن و لەبارەی دەرد ببیستن
لەگەڵ خەڵکی بێ دەرد دا نازانی دەرد چییە

## هاوخەمی و لێك تێگەیشتن

..مەلا نەسرەدین لە کەناری رووبار دانیشتبوو. کەسێك لەوبەرەوە بانگی کرد: (چۆن دەتووانم لە رووبار بپەڕمەوە؟)

مەلا وتی: (خۆ تۆ پەڕیویتەوە؟)

**سەرنج:** خۆخوازی، پەیوەندی تاك لەگەڵ ئەوانیتردا دەپچڕێنێت، بە جۆرێك کە ئەو ئیتر ناتووانێت ئەوانیتر دەرك بکات و هەستی نزیکایەتی و دڵسۆزی لەگەڵ کەسانی دەوروبەریدا نامێنێت. دەرك نەکردنی ئەوانیتر بەو مانایەیە کە ئێمە ناتووانین خۆمان لەبری ئەوان دابنێین و لە چاوی ئەوانەوە بڕوانینە دنیا. ناتووانین نیگەرانییەکان، بۆچوون و کێشەکانیان هەست پێبکەین.

**کەسێك کە لە تۆ تێدەگات، لە براکەت نزیکترە، چونکە هەندێك جار نزیکترین ئەندامی خێزانەکەت تۆ ناناسێت و تایبەتمەندیی راستەقینەی تۆ نازانێت.**

**جوبران خەلیل جوبران**

هەڵمەتێکی پڕ جەنجاڵ بۆ هەڵبژاردن لەئارادا بوو. کاندیدێکی پڕ وزە و چەنەباز هاتە سەر سەکۆیەکە:

(بەڕێزان، ئەو شتەی کە هەنوکە کۆمەڵگاکەمان پێویستی پێیەتی، دەربازبوونە لە رادیکاڵیزم، سۆسیالیزم، کۆمەنیزم و...)

پیرەمێردێك هەڵسایە سەر پێ و وتی: (ببوورە، بیرێکیش لە ڕۆماتیزمەکەی ئێمە بکەرەوە). لە پەیوەندییە سۆزی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆماندا بە پەرداخێکی خاڵی و دنیایەك لە چاوەڕوانییەکان لەوانیتر نزیك دەبینەوە و پێشبینی ئەوە دەکەین کە لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییانەی کە دەیانهێنینە کایەوە سوودمەند ببین. لە پەیوەندییەك لەسەر بنەمای پێداویستی و لاوازی، کەسەکان سۆراخی پڕکردنی پەرداخەکەی خۆیان دەکەن، بۆیە ناتووانن ئەوانیتر دەرك بکەن. ئاواتەکان، پێداویستییەکان، ئازارەکان، عەزابەکان و بیرکردنەوەکانی کەسی بەرانبەر لەبەرچاو ناگیردرێت. هاوخەمی و گرنگیدان لە پەیوەندییەکانی پەیوەست بە لاوازی، بوونی نییە. ئەوەی کە لەم پەیوەندییانەدا بەدی دەکرێت چاوەڕوانیی وەلام نەدراوە، زویربوون، ناڕازیبوون، توڕەیی، کینەی دوولایەنەیە.

## مەڵەیە کە دەڵێن دڵ ئاوێنەی دڵە

## دڵ من لە خەمدا بوو بەخوێن و دڵی ئەو ئاگادار نییە

...کەسێك کەوتبووە ناو ئاو و پەلەقاژەی دەکرد، خەریك بوو دەخنکا. هاواری دەکرد بەڵکو کەسێك پەیدا ببێت و لە خنکان رزگاری بکات. مەلا بەوێدا تێدەپەڕی، پرسی: (ئەم هات و هاوارەت لە چییە؟)

کابرا وتی: (مەلە نازانم!)

مەلا وتی: (خوا لە باوکت خۆش بێت، منیش نازانم، بەڵام هات و هاواریش ناکەم).

## دەرك پێكردنی خەڵك

...كەسێك كەوتبووە ناو بیرێكەوە و هەر هاواری دەكرد: (یارمەتی، یارمەتیم بدەن). مەلا بەوێدا رەت دەبوو گوێی لە هاوار بوو و چووە پێشەوە. بەباشی گوێی رادێرا. كاتێك تێگەیشت كابرای ناو بیرەكە چی دەڵێت، سكەیەكی خستە ناو بیرەكە و وتی: (بێ قەزا بیت، ناو بیریش شوێنی دەرۆزە كردنە؟)

**سەرنج:** یەكێك لە پرسە گرنگەكان لە هاوخەمی و هەستی هاوبەش لەگەڵ ئەوانیتر لەكاتی دەركەوتنی كێشە و سەختییەكاندا، لەبەرچاوگرتنی هەلومەرج و بارودۆخیانە.

لە مێژوودا هاتووە كە كاتی دەركەوتنی قەیرانی ئابووری لە فەرەنسا، برسێتی هەرەشەی لە خەڵكی پاریس دەكرد. (ماری ئەنتوانیت)ی شاژنی فەرەنسە كە ئاگادار بوو لە هەبوونی كێشەی ئابووریی خەڵك، رێگەچارەی مێژوویی خۆی بەم جۆرە دەخاتە روو:

(قەیناكات، ئەگەر خەڵك نانیان بۆ خواردن نییە با كێك بخۆن!) تێگەیشتنی ئەوانیتر و هەلومەرجی سەخت، كلیلی كاریگەرە بۆ یارمەتیدانیان.

## ژیان گەرمای دڵە هاوپەیوەستەکانە

...کچی مەلا دەم بە گریانەوە هاتە لای و وتی: (مێردەکەم چینێکی باش لێیداوم). مەلاش دارێکی دەستدایە و دارکاری کرد و وتی: (ئێستا برۆ بە مێردەکەت بڵێ، ئەگەر جارێکی تر لە کچەکەم بدەیتەوە منیش لە ژنەکەت دەدەم).

**سەرنج:** خراپ لێکتێگەیشتنی گەورە جیاوازیکردنە لەنێوان خۆ و ئەوانیتردا. لە شێوازی زمانی لاوازیدا، (من)، (تۆ)، (ئەو)، (ئێمە)، (ئێوە)، (ئەوان) هەیە ، لە قاموسی هێزی (عەشق)دا تەنیا یەك شت هەیە: (ئێمە)

**چێژەکان زۆرجار شێوەی (من) و (ئێستا) دەگرنەخۆ و شادییەکان شێوەی " ئێمە و هەمیشە ".**

## مرۆڤەکان ئەندامەکانی یەك پەیکەرن

پەنجەکانی دەستێك جیاوازن لە یەکتری، بەڵام ئەم جیاوازییە بەمانای ١)نایەکسانی و ٢)جودایی و جیاکردنەوە نییە. ئەم پەنجانە لە روانینێکی گشتیدا، پێکهاتەی دەستێك پێکدێنن. بەپێی روانگەی لاوازی، دەستی چەپ لە دەستی راست جیاوازە. بەڵام دەستی چەپ و راست بەشێکن لە گشتێکی گەورە بەناوی جەستە. جەستە شتێك نییە جگە لە ئەو ئەندامانەی کە پێکەوە رایەڵن و کرداری ئۆرگانیکیان هەیە. ئەندامەکانی چارەنووسێکی هاوبەشیان هەیە. ئەگەر دەستی چەپ ئازار بچێژێت، هەموو ئەندامەکان ئازارەکە دەیانگرێتەوە.

بەهۆی ئەم پەیوەندییەوە، ئەگەر دەستی چەپ زەبرێك لە دەستی راست بدات، لە راستیدا زەبری لە خۆی داوە. ئەم کردارە جۆرێکە لە لەخۆدان. هەموو مرۆڤەکان لە روانینێکی گەورەدا، بەشێکن لە گشتێکی گەورەتر بەناوی (کۆمەڵگەی مرۆیی). هەموو جیاوازییەکان رواڵەتین. هەموو پۆلێنبەندییەکان، سنوورەکان و درزەکان دەستکردن.

**ئەگەر نیگەرانین، لەبەرئەوەیە کە بیرمان چووەتەوە پەیوەندیمان بە یەکترییەوە هەیە.**

**دایکە تێرێزا**

...بە مەلایان وت چیرۆکێك بگێڕەوە لەبارەی ئەو پیاوانەی کە چەند جارێك هاوسەرگیری دەکەن. وتی: پیاوێك کە لە ژنی پێشووی چوار منداڵی هەبوو لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری کرد کە لە مێردی پێشووی سێ منداڵی هەبوو. پاش ماوەیەك ئەم ژن و مێردە بوونە خاوەنی دوو منداڵ. رۆژێکیان ژنەکە بەپەلە بانگی مێردەکەی کرد و وتی: زووکە وەرە، منداڵەکانی من و منداڵەکانی تۆ خەریکن لە منداڵەکانمان دەدەن.

...بە مەلایان وت کچەکەت داوەتە کێ؟ وتی: (غەریبە نییە، زاوامانە).

غەریبەك بوونی نییە، هەموومان بەشێکین لە خێزانێکی گەورە، خێزانی گەورەی مرۆڤایەتی. هەر گوڵێك ئەلکێنین، لکاندوومانە بە سەری خۆمانەوە. (غەریبە و ئاشنا)، (خۆمانە و ناخۆمانە)، (ئێمە و ئەوان) پۆلێنبەندین لەسەر بنەمای ترس. بەڵام عەشق، واتە رۆیشتن بۆ ئەودیو ئەم پۆلێنبەندییانە. عەشق واتە یەکێتی، یەکبوون، یەکبینی، یەکسانی و برایەتی...

من پێم وایە هەموو ئەو جەنگانەی کە بەدرێژایی مێژوو روویانداوە، جەنگی ناوخۆیی بوون. شتێك نییە بەناوی جەنگی جیهانی و نێودەوڵەتی، جەنگی براکوژییە، جەنگێکە کە لەنێوان خێزانە گەورەکانی مرۆڤایەتیدا روویانداوە و روودەدەن.

**کاتێك هێرش دەکەینە سەر ئەوانیتر، نکوڵی دەکەین لە یەکبوونی خۆمان لەگەڵ مرۆڤایەتیدا. هەربۆیە لە هێرش بۆسەر ئەوانیتر، لە راستیدا بەشێك لە خۆمان دەکوژین.**

**(سۆزان جێفەرن)**

هەستی هاوپەیوەستی کە هێز لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا هەیەتی تەنیا سنووردار نابێت بە بوونەوەرە مرۆییەکان، هێزی چاکە دەزانێت کە کۆمەڵگەی مرۆیی گشتێکی رەها نییە. بەڵکو ئێمە بەشێکین لە یەکەیەکی گەورەتری ناسراو بە سروشت کائینات. ئەو خۆی بە پەیوەست بە هەموو ئەو بوونەوەرە دەبینێت کە لە دەزگای ئەفراندنیدا دەرکەوتوون. خۆی نە بە خاوەنی سروشت بەڵکو خۆی بە بەشێك لێی دەبینێت. دەبێ رێز لە هەموو بوونەوەرەکان و واقعیەتەکانی بوون بگرین و پەیوەندییان لەگەڵدا دروست بکەین.

ئەم جۆرە تێڕوانینە لە نامەی سەرۆکی سورپێستانی سیاتڵ بۆ سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمریکادا هاتووە دەربارەی پێشنیاری حکومەتی ناوەندی بۆ کڕینی زەوی سوورپێستان. ئەم نامەیە وەکو نموونەیەکی مۆدێلی ئەقڵیی هێز (یەکبوون) لێرەدا دەهێنمەوە.

(چۆن دەتووانین ئاسمان و یان گەرمای خاکێك بکڕین، یان بیفرۆشین؟ وێنای شتێکی وەها بۆ ئێمە دوورە لە ئەقڵ و نامۆیە. ئێمە خاوەنی هەواو و شەفافیەتیان نین، چۆن دەتووانن لێمانی بکڕن؟

هەر پنتێك لە خاکی ئەم زەوییە بۆ خەڵکی من پیرۆزە. هەر گەڵایەکی دەرزی و درەوشاوەی سنەوبەر، هەر کەنارێکی لمینی ئەم سەرزەمینە، ئەو تەمەی کە لە چەقی دارستانە تاریکەکاندا چڕ بووەتەوە، هەر مێروویەك کە سروشت پاك دەکاتەوە و دەنگی کە لە ژیان و بیرەوەریی خەڵکی مندا پیرۆزە.

ئێمە بەشێکین لە زەوی و ئەم زەوییە بەشێکە لە ئێمە. گوڵە بۆنخۆشەکان، خوشکانی ئێمە و ئاسکەکان، ئەسپ و هەڵۆ گەورەکان، براکانی ئێمەن. تاشە بەردە بەرزەکان، شیلەی گیاکانی دڵی سەوزاییەکان، گەرمی جەستەی ئەسپە بچوکەکان و مرۆڤ هەموویان سەر بە خێزانی ئێمەن.

ئەو ئاوە سازگارەی کە لە رووبارەکان و جۆگەلەکانیدا دەڕژێت، نەك تەنیا ئاو، بەڵکو خوێنی پێشینانی ئێمەیە. ئەگەر ئەم سەرزەمینەتان لە ئێمە ستاند، دەبێ بیرتان بێت کە ئێرە پیرۆزە...دەبێ فێری منداڵەکانی خۆشتان بکەن کە ئێرە سەرزەمینێکی پاکە و قوژبن بە قوژبنی، لە ئاوە روونەکانی دەریاچە زولاڵەکانیدا رەنگدانەوەی رووداو و بیرەوەرییەکانی خەڵکی من ئەبێ...زەمزەمەی ئاو، دەنگی پێشینانی ئێمەیە.

**"دەبێ ئێمە فێر بین کە چۆن چۆنی برایانە بژین، ئەگینا دەبێ وەکو گەمژەکان لەناو بچین."**

**" مارتین لوتەر کینگ"**

رووبارەکان باری ئێمە، تێراومان دەکەن. بەلەمەکان بەرەوپێش دەمانبەن و منداڵەکانمان تێر دەکەن. ئەگەر ئێمە زەوییەکانمان بە ئێوە بفرۆشین، دەبێ هەمیشە لەبیرتان بێت و فێری منداڵەکانیشتانی بکەن کە (رووبارەکان برایانی ئێمە و ئێوەن و دەبێ لێرە بەدوا وەکو براتان لەگەڵیاندا میهرەبان بن.

ئێمە دەزانین کە پیاوانی سپی رەفتاری ئێمە دەرک ناکەن. بەلای ئەوانەوە، بەشێك لە زەوی، لەگەڵ بەشەکانی تریدا جیاوازی نییە، چونکە پیاوی سپی بێگانەیەکە کە شەوانە هەرچییەك کە بیەوێت لە زەوی زەوت دەکات، بەلای ئەوەوە زەوی برا نییە، بەڵکو دوژمنە، کاتێك کۆنترۆڵی کرد، دیسان بەردەوام دەبێت. ئەو بێرێزی بەرانبەر باوکانی خۆی دەکات و ماف لەدایکبوونی منداڵەکانی خۆشی بیر دەچێتەوە! ئەو لەگەڵ زەوی دایکی و ئاسمانی باوکیدا وەکو ئەو شتانە رەفتاریان لەگەڵدا دەکات کە دەکرێ بکڕدرێن و زەوت بکرێن. یان ئەوەی کە وەکو مەڕ، یان خشڵ بفرۆشێت. ئەو بە مکوڕی و تامەزرۆییەوە زەوی هەڵدەلوشێت و لەناو دەبات و جگە لە بیابانێکی وشك و بێ فەڕ شتێك لە پشت خۆی جێ ناهێڵێت.

| |
|---|
| جودا بوون لە بوونەوەران، تەنیا زادەی ئەقڵە. "کی لویی" |

ڕێگەی ئێمە لەگەڵ هی ئێوەدا جیاوازە. دیمەنەکانی شارەکانی ئێوە چاوەکانی پیاوی سور ئازار دەدات، بەڵام لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە پیاوی سور بەرایی و ناشارستانییە و هیچ تێناگات.

لە شارەکانی پیاوانی سپیدا، هیچ شوێنێکی کپ و ئارام نییە. ئەو شوێنەی کە بتوانرێ لە کاتی بەهاردا دەنگی گەشەکردنی گەڵاکانی لێ ببیسترێت و یان شوێنێك کە بتوانیت گوێ لە دەنگی باڵ لێکدانی مێرووەکان بگریت. لەوانەیە من بەرایی و

ناشارستانی بم و لە هیچ تێنەگەم. دەنگەدەنگی شارەکان، ئازاری گوێ ئەدات. ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت هاواری باڵندەی شەو، و یان گفتوگۆی ئەو بۆقانە ببیستێت کە لە کەناری گۆمێکدا کۆبوونەتەوە، ژیان چ مانایەکی دەبێ؟ من پیاوێکی سورم و هیچ تێناگەم. من و خەڵکەکەم حەزیان لە بای ناو گۆمەکانە لە بۆنی خۆشی ناوێتە بە تەرایی باران و یان بۆنی خۆشی درەختەکانی سنەوبەرە.

مرۆڤێك بەبێ گیانلەبەران چی دەکات؟ ئەگەر هەموو ئاژەڵەکان لەناو بچن، رۆحی مرۆڤ بەهۆی تەنیایی و گۆشەگیرییە گەورەکەی دەمرێت، چونکە هەر شتێك کە بەسەر ئاژەڵان دێت، زۆر زوو بەسەر مرۆڤەکانیشدا دێت. هەموو شتێك گرێدراوە بە یەکترییەوە.

دەبێ ئەوە فێری منداڵەکانی خۆتان بکەن کە لەسەر خۆڵەمێشی پێشنانی ئێمەدا هەنگاو هەڵدێنن و دەبێ سەرزەمینە بپارێزن. فێری منداڵەکانتان بکەن کە خاك دایکی ئێمەیە. ئێمە ئەمەمان فێری منداڵەکانی خۆمان کردووە.



بەرگریکاری راستەقینەی ژینگە کەسێکە کە دەزانێت باووباپیرانی دنیایان بەو نەداوە بەڵکو لە منداڵەکانی بە قەرز وەریگرتووە.

(وحی چی ئودوبون)

هەر شتێك کە لەسەر زەوی بە رەوای دەبینن، بۆ کوڕانی سەر ئەو زەوییەش بە رەوای دەبینن. مرۆڤ تەونی چارەنووس ناهۆنێتەوە، ئەو خۆشی داوێکی تەنراوە لەناو تار و پۆی ژیاندا. هەر شتێکی لەسەر ئەو تەونە پێ رەوا بێت بۆ خودی خۆی بە رەوای دەبینێت.

تەنانەت پیاوی سپیش کە خوداکەی وەکو هاوڕێیەك لەگەڵیدا بە ڕێگـەدا دەڕوات و لەگەڵیدا دەدوێت، لەم چارەنووسە بەدەر نییە. لەگەڵ ئەوەشدا دەتـووانین بـرا بـین. دوایی ئەوە دەبینین. وێڕای ئەمەش، ئێمە شتێك دەزانین کە لەوانەیـە پیـاوانی سـپی درکی پێ نەکەن و ئەویش ئەوەیە کە خودای ئێمە هەر خوداکەی ئێوەیە. لەوانەیە وا بزانن کە خاوەنی خودان، هەروەکو چۆن دەتانەوێ ببنە خاوەنی سـەرزەمینی ئێمـە، بەڵام ناتووانن خاوەنی ئەو و ئێمە بن. ئەو خودای هـەموو مرۆڤەکانـە و بەزەییەکـەی بۆ پیاوانی سور و پیاوانی سپی یەکسانە. وەچـەی پیـاوانی سـپیش ڕۆژێـك لـە ڕۆژان قڕی تێدەکەوێت. لەوانەشە خێراتر لە هەر وەچەیەکی تر و خێڵێکی تر. ئەگـەر ئێـوە شوێنگەی خۆتان پیس بکەن، سـەرەنجام شـەوێك دێـت کـە لـەناو لیخنـاوی خۆتانـدا دەنێژرێن. لە کوێن ئەو درەختانە؟ و لەکوێن هەڵۆکان؟ هەموویان لەناو چوون...

**جیهان نیشتمانی ئێمەیە و هەموو مرۆڤایەتی هۆزی منن.**

**(جوبران خەلیل جوبران)**

# ٣
# خۆبە گەورە بینین و خۆدەرخستن

خۆدەرخستن گرێی خستووەتە ناو کاری ئێمە

دلۆپە کە دەستی لە خۆی بەردا دەبێتە دەریا

*(سایب تەبریزی)*

ئێمــه نامێنین و جیــهـان هــەر دەمێنێ
نــه نـــاو و نــه ناونیشانمان نـــامێنێ
پێشــتر نەبووین و خـــــەلــەلێك نەبوو
لـــەم كاتەش بەدوا نابین و هەروا دەبـێ
(خیام)

## خۆ بە گەورە بینین

...شەوێكیان مانگەشـەو بـوو مـەلا تـەماشـای بـیری ئـاوی دەكـرد. كاتێـك وێنـەی مانگی لە بیرەكەدا بینی وتی: (هەی داد و بێـداد، مـانگ كەوتووەتـە نـاو بیرەكـەوە، دەبێ بۆ رزگاركردنی شتێك بكەم. قولابێكی هێنا و خستیە ناو بیرەكەوە. بە رێكەوت نوكی قولابەكە لە بەردێكی گەورەی ناو بیرەكە گیری كـرد. بـەڵام چـەندەی زۆری لـە خۆی كرد رایكێشێت نەیتوانی. بەهۆی تەقەڵای زۆریەوە پەتەكـە هەڵوەشـا و چـەند هەنگاوێك دوور لە بیرەكە بە پشتدا كەوت. لەو ساتەدا مانگی لە ئاسماندا بـینی و بـە دڵخۆشییەوە وتـی:

(ئەگەر من بەر بوومەوە سەر زەوی و ئازارم پـێ گەیشـت، زۆر گـرنگ نییـە. گـرنگ ئەوەیە كە مانگم لە ناو بیرەكە رزگار كرد).

**سەرنج:** ئۆپەراسیۆنی رزگاركردنی مانگ بە سەركەوتوویی ئەنجام دەدرێت و مـەلا بەم كارە سەرسورهێنەی وەكو (دۆن كیشۆت) ستایشی خۆی دەكات.

رزگـــاركردنی مـــانگ، رزگـــاركردنی زەوی، رزگـــاركردنی دنیـــا و مرۆڤایـــەتی... ئۆپەراسـیۆنی مـەحاڵی زۆر لەبەردەمـدان و دەبـێ مرۆڤـی خـۆ گـەورەبین خـۆی بـۆ

ئەنجامدانیان ئامادە بکات. ئەو لە رۆڵی سوپەرمانێکدا بۆ بەڕێوەبردنی دنیا پلانی جیاجیای دارِشتووە.

رۆژێکیان (هێربێرت فون کارایان)ی رێبەری گەورەی ئۆرکێسترا- خۆی بازدایە ناو تاکسییەك و بەسەر شۆفێرەکەدا هاواری کرد کە دەستبەجێ بکەوێتە رِێ. شۆفێرەکە وتی ئەو شوێنەی بۆی دەچیت کوێیە؟ فون کارایان وتی: (فەرق ناکات بۆ هەر کوێیەك بچیت پێویستیان پێمە).

> **خاکیبوون ئەوەیە کە کەسێك بە محتاجی خۆت نەزانیت، نە لەم دنیایە و نە لەو دنیایەدا. (حەمدون قەسار)**

## کەوتوو بە بەلأم نەك لە سەر سەری فیلەوە

لاوازی، دووچاری خۆ بەگەورەبینینە. هێزیش خۆبەگەورەبینە:

**فیرعەونێك وتی ئەنالحەق، ریسوا بوو**

**مەنسورێك وتی ئەنالحەق، رزگاری بوو**

**(مەولەوی)**

مەنسور وتی ئەنالحەق و فیرعەونیش بانگەشەی خودایی کرد، ئەم لە کوێ و ئەو لە کوێ. بۆچی لاوازی دووچاری خۆگەورەبینی دەبێتەوە. رەگی خۆبەگەورەبینین لە خۆبەکەمبینینیدایە. لاوازی مەبەستیەتی هەستی نزمێتی خۆی بە دروستکردنی شوناسێکی ساختە لەناو ببات.

شوناس دروستکردن، درۆیەکە کەلاوازی بۆ ئەوانیتری پێکهێناوە، بەلأم پێش هەموو کەسێك سەرەتا خۆی فریو دەخوات و درۆی دەستکردی خۆی بڕوا دەکات

(خۆفریـودان). ئـەو درۆیانـەی کـە خۆمـان هەڵیاندەبەسـتین، ئەوەنـدە دووپاتیـان دەکەینەوە کە خۆشمان باوەڕیان پێدەکەین.

...مـەلا بـە کۆڵانێکـدا دەڕۆیشـت کـە منداڵـە خراپـەکان سـەریانکردە سـەری و ئازاریاندا. مەلا کە دەیویست قوتار بێت لەدەستیان، وتی:

(ئایا ئێوە دەزانن کە لە کۆڵانەکەی سەرەوە، لە فلان ماڵ خێر دەکەن؟ منداڵـەکان وازیان لە مەلا هێنا و چوونە ماڵەوە و هەریەکەیان دەفرێکیان هـەڵگرت و بـەرەو ئـەو ماڵە کەوتنە ڕێ کە چێشتی خێریان ئەبەخشی.

کاتێك منداڵەکان ڕۆیشتن، مەلاش چـووە ماڵـەوە و دەفرێکـی هـەڵگرت تـا بـڕوات و چێشتی خێر وەرگرێت. پیاوێك کە بەسەرهاتەکەی بینی: (مەلا تۆ بۆچـی ئەچـیت؟). مەلا وتی: (هەموو منداڵەکان چوون چێشتی خێر وەرگرن، منیش دەچم چێشـتی خێـر وەرگرم).

خۆفریودان بەو جۆرە وەسف کراوە کە وەك بڵێی کەسێك لەسەر قەپان وەسـتاوە تا خۆی بکێشێت، لەکاتێکدا کە ورگی بردووەتە ناوەوە...کاتێك کـاری دروسـتکردنی کەسـایەتی درۆینـە مەیسـەر دەبێـت، لاوازی دڵـی بـەو شـتە پەیوەسـت دەبـێ کـە دروستیکردووە و شـەیدای دەبێـت، چـونکە ئـەوەی کـە دروسـتیکردووە گـەورەترین مایـەی دڵخۆشـی و فریشـتەی ڕزگاریـەتی. بـەم شـێوەیەیە کـە خۆفریـودان دەبێتـە خۆشەیدایی و خۆپەرستی.

لە ئەفسانە کۆنـەکانی یۆنانـدا، (نارسـیۆس) گـەنجێکی جوانـە کـە کچێك بـەناوی (ئەکو) عاشـقی دەبێـت. لەبەرئـەوەی زمـانی ئـەکو بـە فـەرمانی هاوسـەری (زیـۆس) بـڕدراوە، ناتووانێـت عەشـقی خـۆی بـۆ نارسـیۆس دەرببڕێـت و نارسـیۆس ڕووی لـێ وەردەگێڕێت. سەرەنجامیش ئەکو بە دڵێکی شکاوەوە دنیا جێ دەهێڵێت.

بەپێی ئەم ئەفسانەیە، خوداکان بەهۆی ئـەم کارەیـەوە نارسـیۆس سـزا دەدەن و ئەو دەبێتە عاشقی وێنـەی خـۆی. بـەم شـێوەیە ڕۆژێکیـان کـە لـەکاتی سـەیرکردنی جۆگەلەیەك چاوی بە وێنەی خۆی دەکەوێت، بە توندی دەکەوێتە داوی خۆشەویستی خۆیەوە و چیتر ناتوانێت ئەو شوێنە جێ بهێڵێت.

ئەو عاشقە پەیتا پـەیتا ئـازار دەچـێژێت و لاواز دەبێـت و پاشـان دەبێتـە گوڵێـك، ئەمـەش هـەر ئـەو گوڵـەی نارسـیۆس (نێرگـز)ە کـە لـە کـەناری جۆگەلەکانـدا دەڕوێت...هەرچەندە هیندییەکان دەڵێن:

## هیچ بت سازێك نابێتە بت پەرست،

بەڵام مرۆڤی خۆپەرست بتێك لە خۆی دروست دەکات و پاشـان دەبێتـە بەنـد و عاشقی پەروەردەکراوی خۆی. خۆفریودان دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ نەهێنێتـەوە یـاد خـۆی کـە ئـەو شـتەی عاشـقیەتی، خـۆی دروسـتی کـردووە و بـوونی درۆ و ناڕاستەقینەیە.

خۆبەکەم بینین ←خۆفریودان ← خۆ بەگەورەبینین ← خۆپەسەندی ← خۆشەیدایی

هاوسەری (ساشاگیتری)، هونەرمەندی شۆخ و قسە خۆشی فەرەنسـی دەڵێـت: لـە یەکەمین مانگی ئاشنابوون بە ساشا، ڕۆژێکیان زۆر شـێلگیرانە پـێم وت: ئـازیزم، مـن تۆم زۆر خۆش دەوێت، ئەی تۆ؟

لە وەڵامدا وتی: منیش وەکو تۆ، خۆم زۆر خۆش دەوێت.

تاکە کەسێك کە دەبێ لە ژیانتدا بیخەیتە
ژێــر کــاریگــەری خــۆتــەوە، خــۆتیت.
(دایکە تێرێزا)

## خۆنوواندن

...باوکی مەلا ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد کە: (کـە چـوویتە مەجلیسـێکەوە، لـە سەری سەرەوە دانیشە و قسەی گەورە بکە تا لە بەرچاوان دانا و هۆشمەند و گەورە دەرکەویت).

ڕۆژێکیـان چـوونە مەجلیسـێك. مـەلا قسـەی بـاوکی لـەبیر بـوو. هـەر کـە چـووە ژوورەوە، بازیدایە سەر ڕەفەیەکی بەرز و وتی: (فیل، کەرکەدەن، زەڕافە...)

**سەرنج:** ناتووانیت بە پاڵدانەوە لە شوێنی گەورەکان درێژدادڕی بکەیت

خۆبەکەم بینین و سـوکی، خۆنووانـدنی لـێ دەکەوێتـەوە. کەسـی خـۆ بەکـەم زان دەیەوێ خۆی نمایش بکـات. ئـەو شـەیدای ئەوەیـە کـە ببینـرێ و ببیسـترێ. هـەموو ژیانی لـە تـەوەری ڕاکێشـانی سـەرنج و سۆزدا دەسـوڕێتەوە. کەسـی خۆنـوێن حـەز دەکات هەمووان بخاتە ژێر کاریگەرییەوە، هەمووان کارەکانیان واز لێ بێنن و سەیری ئەو بکەن، لەکاتێکدا کە ئەو بە سەعات قسە دەکات، هیچ کەسێك تەنانەت چاویشـی نەتروکێنێت و کەڵك لە قسە ڕێنوێن و جوانەکانی وەربگرێت.

**ئێمە لە سەردەمی حکومەتی کۆمەنیستەکاندا لە سۆڤیەت، تەنیا دوو کەناڵی تەلەڤزیۆنیمان هەبوون. کەناڵی یەکەم وتاردانی سەرانی حزبی کۆمەنیستی پیشان دەدا و کەناڵی دوو، ئەفسەرێکی ئاسایشی پیشان دەدا کە فەرمانی پێدەکردین تەماشای کەناڵی یەك بکەین.**

**(یاکوف ئەلمیر ئەسمیر تف)**

...مەلا نغرۆی گفتوگۆ بوو لەگەڵ یەکێك لە هاورێکانیدا. لەپڕ وتی: (من زۆر داوای لێبووردن دەکەم، چونکە کاتێکی زۆر باسی خۆم کرد، ئێستا نۆرەی تۆیە کە قسە بکەیت. ئەریٚ بە راست دید و بۆچوونت لەبارەی منەوە چییە؟)

لە ناو ناخی هەر مرۆڤێکی خۆنوێن و لوتبەرزدا دەنگێکی ناوەکی هەیە کە بەردەوام دەڵێت: (من گرنگترین مرۆڤی سەر رووی زەویم).

**لاوازی دەیەوێت خۆی گەورە بنوێنێت و هێز هۆکارێك بۆ ئەم کارە بەدی ناکات.**

درۆزن زۆر زووتــر لــە کــەم ئەنــدام بــەر زەوی دەکەوێت.

## خۆهەڵکێشان

مەلا عادەتی وابوو زۆر باسی خۆی بکات. رۆژێکیان یەکێك لە هاورێکانی وتی: (لەمەودا کە هەستم کرد تۆ زۆر درێژ دادەدرێت، من دەڵێم ئحم و تۆ کورت بێنە).

..رۆژێکیان مەلا لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێك دانیشتبوو و قسەی دەکرد. لە مەودای قسەکردندا وتی: (من بینایەیەکم دروست کردووە کە بەرزاییەکەی هەزار مەترە).

هاورێکەی وتی: (ئحم!)

یەکێك لە ئامادەبووان وتی: (پانییەکەی چەندە؟)

مەلا وتی: (یەك مەتر)

خەڵکەکە بە سەرسورمانەوە پرسیان: (بۆچی پانییەکەت ئەوەندەت بەرتەسك داناوە؟) مەلا سەیرێکی هاورێکەی کرد و وتی: (خودا بەرتەسکی بکاتەوە بۆ ئەوانەی کە لەسەرمانی بەرتەسك دەکەنەوە).

**سەرنج**: هەندێ جار کاری خۆنوواندن ئەوەندە درێژدادڕی تێدەکەوێت کە ئەو کەسە هانا بۆ درۆ دەبات. درێژدادڕی و زیادەڕەوی، خۆراکی کەسانی سوکن بۆ سەرپۆش خستنە سەر هەستە نێگەتیڤەکان کە لە ناخیاندا هەستی پێدەکەن. هێز راستگۆیە و لاوازی بە درۆ و فێڵ دەژیت.

# بێدەنگی، هێزە

...ڕۆژێکیان مەلا، بە بازاڕدا دەڕۆیشت، چاوی بە کۆمەڵە خەڵکێك کەوت کە لە دەوری باڵندەیەکی بچوك کۆ ببوونەوە و بۆ کڕین مشتومڕیان دەکرد. لە ئەنجامدا، نرخی باڵندەکە هەر بەرز دەبووەوە تا ئەوەی کە گەیشتە دە سکەی ئاڵتون.

مەلا لەبەر خۆیەوە وتی: پێدەچێ لەم ڕۆژانەدا نرخی باڵندە زۆر گران بووبێت بۆیە باڵندەیەکی وەها بچوك بە دە سکە دەکڕن. وا باشە قەلەکەم بهێنم و بیفرۆشم، بەو کێش و قورساییەی کە هەیەتی حەتمەن زیاتر لە پەنجا سکەم دەدەنێ.

ئەوە بوو کە چووەماڵەوە و پاش بێنە و بەردە لەگەڵ ژنەکەیدا، قەلەکەی خستە بن قۆڵی و هێنایە بازاڕ تا بیفرۆشێت. دەڵاڵەکان دوانزە سکەی مسیان بۆ دیاریکرد. مەلا بە تووڕەییەوە وتی: (بە ڕاستی خەڵکێکی گەمژە و بێ ویژدانن! دوانزە سکەی مس بۆ باڵندەیەکی وەها گەورە دادەنێن، بەڵام پێش سەعاتێك خەریکی فرۆشتنی باڵندەیەکی بچوك بوون کە هێندەی کۆترێکیش نەدەبوو بە دوانزە سکەی ئاڵتون!)

یەکێك لە دەڵاڵەکان وتی: ئەو باڵندەیەی کە تۆ بینیت توتییەکی دەگمەن بوو نەك قەلێکی ئاسایی).

مەلا وتی: (ئەی ئەو توتییە چ هونەرێکی هەیە کە نرخەکەی ئەوەندە گرانە؟)

دەڵاڵەکە وتی: توتی دەتوانێت سەعاتێکی تەواو وەکو مرۆڤ قسە بکات).

مەلا سەیرێکی قەلەکەی کرد. قەلە نەگبەتەکە لەژێر باڵی مەلادا کەوتبووە ناو خەوێکی قووڵەوە. مەلا وتی: (ئەگەر توتییەکەی ئێوە سەعاتێك قسە ئەکات، ئەم قەلەی من دەتوانێ دوو سەعات بێدەنگ بێت و بیر بکاتەوە).

سەرنج:

**نهێنییەکانی حەقیان فێری هەر کەسێك کرد**

**مۆریان کرد و دەمیان دووری**

**(مەولەوی)**

هێز بێ دەنگ دەبێت و لاوازی ئەدوێت و هەرا دەنێتەوە، چونکە دەبیچ خۆی پیشان بدات، زانیاری و پێگەی زانستیی شکۆمەندانەی خۆی ئاشکرا بکات.

> **سۆراخکەر دۆزەرەوەیە و دۆزەرەوە بێدەنگە.**
>
> **(خواجە عبدالله انساری)**

ئازاردەرترین کاری کراو بۆ لاوازی (بێدەنگی)یە. ئەو ناتووانێت بێدەنگ بمێنێتەوە، دەیەوێ قسەکەری هەموو کۆڕێك و گەنمی هەموو ئاشێك بێت. ئاماژە بە هەر بابەتێك بکەیت، ئەو تیایدا بیرۆکە و بۆچوونی هەیە. ئەگەر باسی دوورگەکانی (لانگەرهانز) بکەیت ئەوا ئەو باسی درێژایی و پانتایی جوگرافی، سەرچاوە سروشتییەکان و خەڵك و نەریتی ئەو شوێنانە دەکات! ئەوەندە بەسە بڵێیت. ئەو ئەقڵی هەمووان و هەموو شتێ زانە. ئەستەمە باسی شوێن و بوارێك بکەیت و ئەو زانیاری لەبارەیەوە نەبێت.

> **کەسێك کە خۆی لە پشت زاراوە ئاڵتونییەکان دەشارێتەوە، وەکو ژنێکە کە خۆی لە پشت دیکۆری رووکەش دەشارێتەوە تادزێوییەکەی داپۆشێت.**
>
> **(جوبران خەلیل جوبران)**

...مەلا و کوڕەکەی لە شەقامێکدا خەریکی پیاسە بوو. کوڕی مەلا وتی: (باوکەگیان، باڵندەکان چۆن دەتووانن بفڕن؟) مەلا لە وەڵامدا وتی: (پرسیارێکی باشت کرد، بەڵام لەبەرئەوەی وەڵامەکەی دوورودرێژە لێگەڕێ دوایی بۆتی روون بکەمەوە).

کوڕی مەلا وتی: (باوکە هەورەتریشقە چۆن دروست دەبێ؟)

مەلا وتی: (کوڕی خۆم تۆ ئێستا تەمەنت کەمە و روونکردنەوە بێ سوودە. با کەمێك گەورە ببیت، کە گەورە بوویت لەم بارەیەوە قسە دەکەین). کوڕی مەلا پرسی: (هەورەکان چۆن لە ئاسماندا دێنە کایەوە؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (راستییەکەی وەڵامەکە لەسەر زمانم بوو، بەڵام ئێستا نایەتەوە یادم). پاش گەیشتنەوە ماڵ، کوڕی مەلا وتی: (ببوورە باوکە گیان کە بە پرسیارەکانم کاتی تۆم بەفیڕۆدا).

مەلا وتی: (نا کوڕەکەم، بەهیچ شێوەیەك وا نییە. تۆ ئەگەر نەپرسیت، کەواتە چۆن دەتووانیت فێر بیت).

سەرنج: مەترسە لەوەی کە بڵێیت (هەڵەم کرد)، (بمبوورە) و (نازانم).

**ئەوانەی کە لە فێربووندا هەوڵ نادەن، نابێ هەرگیز لە ئەنجومەنی دانایاندا دەمی وتاردان بکەنەوە.**

**(بزورگمیهر)**

باڵگەشە مەکە بەوەی کە لەوانیتر بە زانست بەرزتریت گەر
لوتبەرزی بنوێنیت لە هەموو ئەوانەی کە دەزانن نزمتریت
(سەعدی)

## لوتبەرزیی زانستی

...مەلا و ژمارەیەك لە هاوشاریانی بە رێگای بیاباندا رەت دەبوون. سەروەختی شەو لە دەوری ئاگر کۆ بوونەوە و دەستیانکرد بە قسەکردن لەبارەی بیروباوەڕی خۆیانەوە. باس و خواسیان زیاتر لەبارەی وشتر و تایبەتمەندییەکانی ئەو ئاژەڵە بوو. ئەوان سەرسام بوون بە رەزایەت و قەناعەتی وشترەکان. ستایشی هێز و توانای ئەو ئاژەڵەیان دەکرد و دەیانوت بەرگەگرتن و ملکەچییان جێگەی سەرسامییە.

یەکێك لە کاروانچییەکان وتی وەرن بە نووسینی ستایش یان وێنەکێشانی وشتر، رێز لەم ئاژەڵە بنێین. ئەو لەکاتێکدا کە ئەم رستانەی دەوت، کاغەزێکی هەڵگرت و چووە ناو خێمەیەك کە بە مەشخەڵێك رووناك کرابووەوە.

پاش چەند خولەکێك لە خێمەکە هاتە دەرەوە و کارەکەی خۆی پیشانی هاورێکانیدا. ئەو وێنەی وشترێکی لە حاڵەتی هەڵساندا کێشابوو کە مرۆڤ وای بۆدەچوو زیندوو بێت. پاشان کەسێکی تر چووە ناو خێمەکە و زوو گەڕایەوە و شرۆڤەیەکی کورتی کە لەبارەی سوودەکانی وشتر نوسیبوو بۆ کاروانچییەکان خوێندەوە.

کەسی سێیەم شیعرێکی رەوان و دڵڕفێنی لە وەسفکردنی وشتردا خوێندەوە. سەرەنجام نۆرەی مەلا هات بچێتە ئەو خێمەیە. ئەو داوای لە هاورێکانی کرد بۆ

ماوەیەك سەر نەکەنە سەری. پاش چەند سەعاتێك ئاگرەکە کوژایەوە و ئەو هاورێیانەی کە چاوەڕێیان دەکرد خەویان پیا کەوت.

رۆژی دواتر هەمووان چاوەڕوانی مەلا بوون. رۆژی دووەم و سێیەمیش بێهودە بە چاوەڕوانییەوە تێپەڕی. سەرەنجام لە رۆژی پێنجەمدا، پەردەکەی خێمەکە هەڵدرایەوە و مەلا بە ماندوویی و بە چاو و روومەتی قوڵ و ریش و قژێکی ئاڵۆزەوە دەرکەوت و بە هەنگاوی سست و لەسەرخۆ و نیگایەکی کزەوە چووە لای دۆستانی و بە ماندوویییەوە کتێبێکی قەبەی فڕێدا. مەلا بە گەورەیی لەسەر بەرگی کتێبەکە نوسیبووی: (وشتری تەواو و بێ کەم و کوڕی دەبێ چۆن بێت).

**سەرنج:** بانگەشەی فەزڵ و خۆگەورەبینین هەندێ جار تا ئەو شوێنە بڕ دەکات کە هەندێ جار کەسانێك رێگە بە خۆیان دەدەن وەکو رەخنەگرێك رەخنە لە دنیا و ئەفراندن بگرن و وەکو عەقڵی گشت، بەرنامە و پلانی نوێ بخەنەڕوو.

**گەر وەکو یەزدان دەستم بە فەلەك بگەیشتایە**

**ئەم فەلەکەم لەم میانە هەڵگرتایە**

**و لە نوێوە فەلەکێکی ترم دروست دەکردەوە**

**کە بە ئاسانی بگەیشتایە بە کامی دڵ**

**(خەیام)**

...مەلا لەژێر درەختێکی گوێز دانیشتبوو و سەیری لق و پۆپەکانی دەکرد. کە گوێزەکانی بە لقە هەڵواسراوەکانەوە بینی لەبەر خۆیەوە وتی: (چ حیکمەتێکە کە خودا لەم درەختە گەورەیەدا میوەیەکی وەها وردی دروستکردووە، لەکاتێکدا کە کاڵەکێکی گەورەی داوەتە ئەو چڵە گیا بچوکە!...دەبوایە درەختێکی وەها گەورە میوەی گەورەی وەکو شوتی بدات).

خـەریکی وتـنی ئـەو قسـانە بـوو لەبـەر خۆیـەوە کـە لـەپڕ گوێزێـک لـە لقەکـەی بەربووەوە و بەر سەری کەوت. مەلا بە بینینی ئەم بارودۆخە لە قسـەکەی پەشـیمان بووەوە و وتی: (خودایە ئیشێکی باشت کرد کە میوەی ئـەم درەختـەت بچوك و ورد دروستکردووە، ئەگینا میوە گەورەکەی سەری منی شکاندبوو).

**قەلەڕەش و توتی هەردووکیان رەش و دزێو دروستکران. توتی سکاڵای کرد و خوداوەند جوانی کرد، بـەڵام قەلـەڕەش وتـی: (هـەر شـتێك لـە هاوڕێوە بگات باشە) و سەرەنجامەکەش ئەوە بوو کە دەیبینیت. توتی هەمیشە لە قەفەس و قەلەڕەش هەمیشە سەربەستە.**

هۆکاری ئەمەی کە هەندێ کەس گەورە دەردەکەون،

ئەوەیە کە مرۆڤی بچوك لە دەوروبەریانن.

## سوك لەقەڵەمدان

...ڕۆژێکیان حاکم لە دانیشتنێکدا بۆ تاقیکردنەوەی هۆشی دەوروبەری خۆی مەتەڵێکی خستەڕوو. ئەو بە گەچ هێڵێکی لەسەر تەختەڕەش کێشا و داوای لە راوێژکارەکانی کرد بەبێ بەکارهێنانی دەست، ئەو هێڵە بچوکتر بکەنەوە.

هیچ کەسێك نەیدەزانی چۆن بەبێ دەست لێدانی تەختە هێڵەکە بچوکتر بکەنەوە. مەلا کە لەو دانیشتنەدا ئامادەبوو رایگەیاند دەتوانێت مەتەڵە حەل بکات. لە شوێنی خۆی هەڵسا و هێڵێکی تری بەرزتری لەو هێڵەی کە حاکم کێشابووی کێشا و بەم شێوەیە هێڵی یەکەم بێ ئەوەی کە لە ئەندازەکەی کەم بێتەوە، بچوکتر بووەوە.

**سەرنج:** دوو شێواز بۆ داپۆشینی هەستی بچوك لەقەڵەمدان و کەمی هەستی زەنگینی هەیە: یەکێکیان خۆنووواندن و لوتبەرزی و دووەمیان بچوککردنەوە و سەرزەنشتکردنی ئەوانیتر. یان دەبێ خۆمان گەورە پیشان بدەین و یان ئەوانیتر بچوك بکەینەوە.

ئامادەیی لاوازی یەکسانە بە دەرکەوتنی سوك لەقەڵەمدان، سەرزەنشت و رەخنەی نادادپەروەرانە. لە بنەڕەتدا هەر جۆرە، گاڵتەپێکردن، عەیب دۆزی، زمان پیسی، شکاندن و رەشکردنی کردارەکانی ئەوانیتر سەرچاوەگرتووی لاوازی و بێ دەسەڵاتییە.

**خراپترین کەس ئەوەیە کە تەنیا گرنگی بە بینینی کەموکوڕییەکانی ئەوانیتر دەدات، وەکو ئەو مێشەی کە تەنیا سۆراخی نیشتنەوە دەکات لەسەر برین.**

...مەلا دەیویست هاوسەرەکەی تەڵاق بدات. پێیان وت: (ژنەکەت عـەیبی چـییە؟)
وتی: (ئایا کەس عەیبەی ژنەکەی باس دەکات؟)

پاش ئەوەی ژنەکەی تەڵاقدا، لێیان پرسی: (هاوسەری پێشووت عەیبی چی بوو؟)
وتی: (ئایا کەس عەیبی ژنی خەڵکی دەردەبڕێت؟)

**بینینی عەیبەی خەڵکی نە رەوایە و نە پیاوەتی**

**سەیرێکی خۆت بکە ئەو هەموو گوناهەت هەیە**

**(سەعدی)**

**تاکەکەس لەو قسانەی کە لەبارەی ئەوانیترەوە دەیکات باشتر دەناسیت نەك ئەوەی کە لەبارەیەوە دەڵێن.**

پاشایەکی هەوەسباز بە دەوروبەری وت ئەگەر عەیبە و کەموکورییـەك لـە کەسـێك ببینن ئەوا دەبێ ئەو کەسە درهـەمێك غەرامـە بـدات. یـەکێك لـەوان پیـاوێکی رووتـی بینی و وتـی: (دەبـێ بـە فـەرمانی پاشـا درهـەمێك غەرامـە بـدەیت). پیاوەکـە وتـی: (چی...چی...بۆچـی دەبـێ بیـدەم؟) وتـی: (دەبـێ دوو درهـەم بـدەیت، چـونکە دەرکەوت کە زمانیشت تەتەڵە دەکات).

داردەستەکە یەخەی پیاوەکەی گرت. ئەو ویستی بـەرگری لـە خـۆی بکـات، بـەڵام دەرکەوت کە دەشەلێت، داردەستەکە وتی: (ئێستا دەبێ سێ درهەم بدەیت).

لـەم گێـرە و کێشـەیەدا کـڵاو لەسـەری کـابرا کەوتـە خـوارەوە، کەچـەڵ بـوو. داردەستەکە داوای چوار درهەمی کرد. کابرای بێ نەوا ویستی رابکـات، داردەسـتەکە

بۆی دەرکەوت کە کەم ئەندامیشە. داردەستەکە وتی: (لە شوێنی خۆت مەجوڵێ، تۆ گەنجینەیەکی زۆر بەهاداریت!)

هەندێ کەس لە دۆزینەوەی عەیب و عاری ئەوانیتردا ئەوەندە تامەزرۆ و سەرسەختن کە وەك بڵێی بەدوای گەنجینەیەکەوەن! وەك بڵێی لەگەڵ هەر کەموکورییەکدا کە لە کەسێکیدا دەبیننەوە، پاداشت و خەڵاتیان دەدرێتێ.

هێز داپۆشەری عەیبەکان و لاوازی پەردە لادەرە. هێز نیوەی پڕ و لاوازی نیوەی خاڵی کەسایەتی تاکەکان دەبینێت.

هێز رێز لەوانیتر دەگرێت، هەمووان بە ئازیز دەبینێت و دەیەوێ بە توانا و مەزنایەتی خۆیان بزانن، بەڵام لاوازی بەدوای تێکدان، گەوجاندن و سوککردنی ئەو کەسانەدا وێڵە کە لە پەیوەندیدان لەگەڵیدا.

بڕیار بدە کە دۆزەرەوەی عەشق بیت نەك کەم و کوڕی.

(جیرالد جمبالسکی)

## دۆزینەوەی کەم و کورتی

...مەلا بۆ گۆڕینی بارودۆخی ژیانی، قاوەخانەیەکی گەورە و سەنگینی بەناوی (قاوەخانەی ئەستێرەی مسی) لە شەقامێکدا کردەوە کە ڕاڕەوی تێپەڕینی خەڵکی چەندین گوند و ڕێبوارانی زۆر بوو. ئەو هەوڵی دەدا بە هێنانەکایەی فەزایەکی ئاسودە، لەگەڵ خزمەتگوزاریی ڕاستگۆیانە و نرخی گونجاو، کڕیار ڕابکێشێت، بەڵام سەیر بوو کە ئەم قاوەخانە و میوانخانەیە ئەوەندە پێشوازی لێ نەکرا.

مەلا لەوپەڕی نائومێدیدا لەگەڵ کوێخای ژیری گوندەکە ڕاوێژی کرد. کوێخا پاش هەڵسەنگاندنی هەلومەرجەکە وتی:

(من ڕێگەچارەیەکی گونجاوم بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی تۆ هەیە. دەبێ تۆ ناوی قاوەخانەکەت بگۆڕیت. دەبێ ناوی ئەو قاوەخانەیە (پێنج زەنگ) بێت و ڕیزێکی شەش زەنگوڵەیی پێوە هەڵواسیت).

مەلا بە سەرسوڕمانەوە وتی: (شەش زەنگ؟ پێکەنیناوییە..ئەم کارە چ سوودێکی دەبێ؟)

کوێخا وتی: (تاقی بکەرەوە، ئەنجامەکەی دەبینیت).

مەلا بە ڕەشبینی و نائومێدییەوە شێوازەکەی کوێخای بەکار هێنا. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە هەر ڕێبوارێك کە بەلای قاوەخانەکەدا تێدەپەڕی، درکی بەم هەڵەیە دەکرد. بەو خەیاڵەی کە کەس پەی بەو مەسەلەیە نەبردووە، بۆ ڕاستکردنەوە دەچووە ناو قاوەخانەکە و پاش چوونە ژوورەوە دەکەوتە ژێر کاریگەریی فەزای ئارامی ئەو شوێنە و بۆ تازەکردنەوەی هێز و توانای، هەڵوەستەیەکی دەکرد. ئەمەش هەر ئەو دەرفەتە زێڕینە بوو کە مەلا بۆ ماوەیەکی زۆر بەدوایدا دەگەڕا...

**سەرنج**: هەموومان هەڵگری باری عەیبەی خۆمانین  تانەی چی لە عەیبەی ئەوانیتر بدەین

لە رەخنەگرتن و دۆزینەوەی کەم و کورتیدا، ئامانجی رووخاندنی ئەوانیتر هەیە، بەڵام هۆکارێکی تر کە لاوازیی ئەم روانگەیە دەگرێتە بەر ئەوەیە کە ئەو لە رێگەی پیشاندان و راگەیاندنی لاوازییەکان و کێماسی کارەکانی ئەوانیتر دەیەوێ توانای ئەقڵی و تیژبینی خۆی بخاتەروو و عەرزی عەزەلات بکات!

لە گفتوگۆ و دیدارەکاندا ئامانجی هەردوولا نەك گەیشتن بە راستی بەڵکو سەلماندنی زانین و توانای زانستییە لەبەرانبەر ئەویتردا.

دیل کارنگی لە کتێبی (هونەری دۆزینەوەی هاورێ)دا چیرۆکێکی ئەزموونەکەسییەکانی دەگێرێتەوە کە ئەم پرسەی بە تەواوی تیادا دەرکەوتووە.

(شەوێکیان لە میوانداریيەکدا بەشداریم کرد کە لەسەر شەرەفی (سێر راس) رێکیان خستبوو. لە ماوەدای نانخواردنەکەدا پیاوێك کە لە تەکمەوە دانیشتبوو، چیرۆکێکی پێکەنیناوی گێرایەوە و هەڵوەستەیەکی زۆری لەسەر وتەیەك کرد: (خودایەك هەیە کە وێرای خوار و خێچییەکانی رۆیشتنمان، ئامانجی کۆتاییە).

> **هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە وێنای ئەوە بکات ئەو شتەی کە دەیڵێت یەکسانە بە راستی و ئەویتریش بە نۆرەی خۆی مافی ئەوەی هەیە وێنای ئەوە بکات کە ئەم کەسە لەبنەڕەتدا مافی ئەوەی نییە وێنایەکی وەهای هەبێت.**
>
> **(ساموێل جۆنسن)**

گێڕەرەوەکە پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی کە ئەم وتەیە لە ئینجیلدا هاتووە و هەڵە بوو. من ئەمەم دەزانی و کەمترین گومانیشم لەمبارەیەوە نەبوو. بەڵام لەبەرئەوەی یەکلایەنە هەستی گرنگبوون و پیشاندانی باشترین لە مندا چەکەرەی کردبوو، بێ ئەوەی کەس داوام لێبکات خۆم کرد بە راسپێردراوی راستکردنەوەی قسەکانی. دەستبەجێ هەڵوێستێکی داکۆکیکارانەی گرتەبەر: (چیت وت؟ وتەی شەکسپیرە؟ مەحاڵە! قسەی پوچە! وتەی ناو ئینجیلە).

**هیچ شتێك ئەوەندی راستکردنەوەی هەڵەکانی ئەوانیتر من منێتی و خۆبینیمان تێر ناکات.**

بڕیارمدا ئەم پرسیارە لە (فرانك گامۆند)ی هاوڕێم بکەم کە تەمەنێکی لە توێژینەوەی شەکسپیردا بەسەر بردبوو و لەلای چەپمەوە دانیشتبوو. ئەو بە وریاییەوە گوێی گرت، پاشان لەژێر مێزەکەوە لەقەیەکی لە قاچمدا و وتی: (دیل! تۆ لە هەڵەدایت. ئەو کابرایە راست دەکات. ئەم وتەیە لە ئینجیلدا هاتووە).

دوادواکانی شەو کاتێك گەڕاینەوەماڵەوە، بە گامۆندم وت: (فرانك خۆ تۆ دەتزانی ئەم وتەیە هی شەکسپیرە!)

فرانك لە وەڵامدا وتی: (هەڵبەت دەمزانی. هاملێت پەردەی پێنجەم، دیمەنی دووەم. بەڵام دیلی ئازیز! ئێمەیان بۆ میوانداری بانگهێشت کردبوو. بۆچی دەبووایە بیسەلمێنین کە ئەو پیاوە بەهەڵەداچووە؟ بۆچی نەدەبووایە ڕێگەمان پێ بدایە ئابڕوی خۆی بپارێزێت؟ بۆچی مشتومڕت لەگەڵدا کرد؟ هەمیشە لە مشتومڕی بێهودە خۆت بپارێزە).

**لەکاتی مشتومڕدا هەمیشە ئەوە راستییە کە بزر دەبێت.**

**(پابلیسیۆس سیراس)**

ئەم پیاوە دەرسێکی دایە من کە هەرگیز بیرم ناچێت. من نەک تەنیا بوومە هۆی نارەحەتکردنی قسەکەرەکە، بەڵکو هاورێکەشم خستە ناو هەلومەرجێکی دژوارەوە.

لە مشتومڕدا نابیتە براوە. ناشتووانیت ببیت، چونکە ئەگەر لە رواڵەتیشدا براوە بیت، لە راستیدا دۆڕاویت. بۆچی؟...وایدابنێ بەسەر ئەویتردا سەرکەوتوویت و بە هەزاران بەڵگە قسەکەی ئەوت پوچەڵ کردووەتەوە و سەلماندووتە نەزانە. زۆر باشە، ئینجا چی؟ تۆ دڵت ئاوی خواردووەتەوە، ئەی بەرانبەرەکەت؟ کارێکت کردووە کە ئەو هەست بە سوکی بکات. تۆ بوویتە هۆی بریندداربوونی هەستی بەخۆزانینی.

**لەوانەیە تۆ راست بیت و گیانت بکەیتە قوربانی قسەکەت، بەڵام ئەگەر کارەکەت مشتومڕە و سەلماندنی حەقانیەتی خۆتە و هەوڵ دەدەیت بیروباوەڕی یەکێکی تر بگۆڕیت، دڵنیا یە کارەکەت بە هەمان بارەتەقا بێهودەیە کە لەسەرحەق نەبوویتایە.**

**" دیل کارنگی "**

خـــــاکیبوونە هۆکاری گەیشتن بە تەواوەتی
وەکو چۆن سوار کە گەیشتە مەنزڵ دابەزێت
سایب تەبریزی

## خاکیبوون

...مەلا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد. لێیان پرسی ئایا موعجیزەشت هەیە. وتی: (ئەو درەختە لەژێر فەرمانی مندایە. ئەگەر بانگی بکەم دێتە لام). وتیان: (زۆر باشە، ئەمە بکە). مەلا بە دەنگێکی بەرز وتی: (ئەی درەخت وەرە لام). بەڵام درەختەکە لە شوێنی خۆی نەبزووا. بە مەلایان وت: (تۆ خۆ وتت درەختەکە دێتە لات، ئەی چی بوو بۆ نەهات؟) مەلا وتی: (هیچ کام لە پیاوچاکان و گەورەکان لوتبەرز نین. ئێستا کە ئەو نەهات من دەچمە لای).

سەرنج: لاوازی دەتوانێت خاکی بێت، چونکە خاکیبوون کارێکی گەورە و سەختە کە ئەنجامدانی تەنیا لە توانای هێزدایە. خاکیبوون ترۆپکی هێزە.

### حاڵەتەکانی لوتبەرزی:

١–هەستی تاکانەیی: ئێمە لەوانیتر جوداین.

٢–باڵاخوازی: ئێمە لە سەروو ئەوانیترەوەین.

٣–سەنگی بەدەستهێنراو: پێگە و پایەی ئێمە پەیوەندی هەیە بە هۆکارە دەرەکییەکان لەوانەش رەفتاری ئەوانیتر لەگەڵ ئێمە و یان ئەوەی کە خۆمان ئەنجامی دەدەین. سەنگ شتێکە کە دەبێ بەدەست بهێنرێت.

حاڵەتەکانی خاکیبوون:

**١-هەستی پەیوەستی:** هەموومان یەکین.

**٢-یەکسانی:**هەموومان لەگەڵ یەکتریدا یەکسانین.

٣-سەنگی خودی: پێگەی من خۆیی و نەروشێنراوە و پەیوەندی بەو شتانەوە نییە کە ئەوانیتر دەیکەن و ئەوەی کە من ئەنجامی دەدەم.

## باڵاخوازی

> **هەموو گیانلەبەران یەکسانن، بەڵام هەندێ لە گیانلەبەران یەکسانترن.**
> **(جۆرج ئۆرویل، مەزرای ئاژەڵان)**

لە خاکیبووندا گەورە دەبیت لە لوتبەرزیدا زەلیل و ریسوا دەبیت

***"سەنایی غەزنەوی"***

شەوێکیان عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی خەلیفەی ئەمەوی میوانی هەبوو و خۆی سەرقاڵی نووسین بوو. چرای حوجرەکە خەریك بوو دەکوژایەوە. میوانەکە وتی: (من هەڵدەستم و ڕۆنی چراکە دەڕێژم). عومەر فەرمووی: (جوامێرێك نییە کە مرۆڤی میوان ناچاری کار بکات). میوان وتی: (دە ڕێگە بدە تا غوڵامەکەت هەڵسێنم). عومەر وتی: (ئێستا خەوتووە). ئینجا خۆی هەڵسا، چرایەکەی هەڵگرت و پڕی کرد لە ڕۆن. میوانەکە وتی: (ئەی ئەمیر، بۆچی خۆت ئەم کارەت ئەنجامدا؟)

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وتی: (کاتێك چووم عومەر بووم و کە گەڕامەوەش هەر عومەرم. کەوایە هیچ لە من کەم نەبووەتەوە).

## خاکەڕایی و لوتبەرزی لە قسەی عاریفەکاندا

**ئیبن جەلا:** خاکیبوون، شوکری مەزنایەتییە.

**ئەبو سلێمان دارانی:** خاکیبوون ئەوەیە کە لە کاری خۆتدا هیچ خۆپەرستییەك پیشان نەدەیت.

**ئەحمەد ئەنتاکی:** گەورەترین خاکەڕایی ئەوەیە کە لوتبەرزی و توڕەییت لێ دوور بخاتەوە و تیاتیدا بمرێنێت.

**هەر کەسێك پێی وابێت کە نەفس ئەو لە نەفسی فیرعەون باشترە، لوتبەرزییەکەی دەرخستووە.**

**(حەمدون قەسار)**

**فەزیلْ عەیاز:** خوای تەعالا سروشی دایە شاخەکان کە من لەسەر یەکێك لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەراندا دەدوێم. هەموو شاخەکان لوتبەرزییان نوواند، جگە لە لوتکەی سینا کە سەری دانەواند. بۆیە کەرامەتی کردارەکە حەقی پێدرا.

**مەنسور بن عەمار:** چاکەکارانەترین جلی بەندە، خاکیبوونە.



چەندەی کەوان چەماوەتر بێت، تیرەکە دوورتر دەهاوێژێت.

٤

# خـــۆســـەپـانـدن

هەموو کاری خۆسەپێنەرانەم

بە بەدناوی گەیشت دواجار

*(حافز)*

ئەو تاج و تەختەی کە هەتە بشارەوە ئەی بەخت چاك
رامێنە کوا کەیقوباد و سەنجەر و سوهراب؟
(مەولەوی)

## دەسەڵات خوازی

کاریلەکەی مەلا لە سەر بەرزاییەك وەستابوو. گورگێك بەوێدا تێدەپەڕی، کاریلەکە دەستیکرد بە جوێندان پێی. گورگەکە وتی:

(تۆ جوێنم پێ نادەیت، بەڵکو ئەو شوێنە بەرزەی کە تۆ لەسەری وەستاوی جوێنم پێ دەڵێت).

**سەرنج:** ئەو کەسەی کە خۆی بە نزم دەبینێت، بەدوای ڕۆیشتن بەرەو بەرزاییدا وێڵە، بەرزایی ناودێرکراو بە (ناونیشان) و (پێگە).

رازی سەرنجڕاکێشبوونی پێگە و پایە چیە؟ لاوازی دەیەوێت لە بەدەستهێنانی پێگە و پایەدا سۆراخی (هێز) بکات.

دوو جۆر هێز هەن:

**١–ئەو هێزەی کە دەدۆزرێتەوە:** هێزی ناوەوە. مرۆڤ بە دۆزینەوەی گەوهەری خۆی، بۆی دەردەکەوێت کە خۆی هێزە.

**٢–ئەو هێزەی کە بەدەست دەهێنرێت:** هێزی دەرەکی. کاتێك مرۆڤ لەناوەوەڕا هەست بە لاوازی و بچوکی دەکات، دەیەوێ هەستکردن بە بێ هێزی بە بەدەستهێنانی سەرچاوە دەرەکییەکانی هێز، لەوانەش هێزی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووری و سەربازی قەرەبوو بکاتەوە.

له بنەڕەتدا ئەمە هاوكێشەیەكە. چەندەی زیاتر روومان لە هێزی ناوەوەی خۆمان بێت كە بنەڕەتێكە لەسەر خۆی وەستاوە، لە خۆهەڵواسین بە رواڵە دەرەكییەكان دوور دەكەوینەوە و بە پێچەوانەشەوە.

## هێزی ناوەوە و دەرەوە

ژیانی گاندی و زۆرێك لە گەورەكانی مێژوو وێنەدانەوەی پشت بەستنە بە هێزی ناوەوە و سەربوردەی خۆسەپێنەران و تاكڕەوانی وەكو هیتلەر، مۆسۆلینی، ستالین، پینوشێ، فرانكۆ و...نموونەیەكە لە پشت بەستنیان بە هێزە دەرەكییەكان بۆ داپۆشینی ترسەكان، كێماسییەكان و گرێیەكانی سوكی و بچوكییان.

له پارێزگای سنووری باكووری خۆرئاوای هیندستان، لەناو شاخ و تاشە بەردە بەرزەكاندا لە كەناری گەرووی خەیبەر، رابەرێك بەناوی (عەبدولقادرخان) كۆمەڵگەی بەڕێوە دەبرد و حوكمڕانیی خەڵكی دەكرد، كۆمەڵگەیەك كە یاساكەی (سەر بەسەر) بوو.

پاتانەكان (پشتۆنەكان) خەڵكێكی بێ باك و جەنگاوەری بە ورە بوون و هەن. كاتێك گاندی بڕیاریدا بچێتە سنووری باكوور، هەموو خەڵكی هیندستان نیگەرانی سەلامەتی ئەو بوون. هاوڕێكانی وتیان: (ئەمانە خەڵكانێكی رەقن. بینینی ئەوان چ سوودێكی هەیە؟ جەنگان تاكە شتێكە كە دەیزانن).

گاندی لە وەڵامدا وتی: (منیش جەنگاوەرم. دەمەوێ فێریان بكەم كە چۆن چۆنی بەبێ توندوتیژی و ترس بجەنگێن).

كۆمەڵێك لە (پاتان)ە چەك لە شانەكان كە پرسیاریان لە مێشكدا بوو لە دەوری ئەم پیاوە بچكۆلەیە گرد بوونەوە كە پەڕۆیەكی لە خۆی ئاڵاندبوو تا بزانن چی

دەڵێت؟ گاندی بە نەرمی لێی پرسین: (ئایا دەترسیت؟ ئەگەر ناترسیت بۆچی چەك لەگەڵ خۆتاندا هەڵدەگرن؟)

پشتۆنەکان مات و مەلول لێیان دەڕوانی. تاوەکو ئەو کاتە کەس جەسارەتی ئەوەی نەکردبوو بەم شێوەیە قسەیان لەگەڵدا بکات. گاندی لە درێژەدا وتی: (من هیچ ترسێکم لەدڵدا نییە، بۆیە چەکدار نیم).

عەبدولقادرخان چەکەکەی بەلاوە نا و (پاتان)ەکان بە پەیڕەوی لە رابەرەکەی خۆیان بوون بە ئازاترین پەیڕەوانی رێگای عەشق، رێگایەکی عەشق کە گاندی خستبوویە روویان.



**هێزی سەرچاوەگرتوو لە ژمارەی کەسەکان مایەی دڵخۆشی ترسنۆکەکانە. ئەو کەسەی کە رۆحی ئازایە، تەنیا خۆشی لە نەفەسی ململانێ دەبینێت.**

کەسی خۆسەپێن، شوناس، سەنگ و ئاسایشی خۆی لەو پێگەیەوە وەردەگرێت کە تیایدایە، بۆیە سەخت پێیەوە وابەستەیە و بەبێ ئەمە هەست بە مەترسی و پوچی دەکات. لە رێگەی ئەو پێگەیەوە کە هەیەتی دەتوانێت توانا بەوانیتر بدات. بۆیە دەبێ بەردەوام سەرنجی ئەوانیتر بەلای پێگەی خۆیدا راکێشێت.

بیرت بێت کە من دایکتم...

بیرت بێت کە من هاوسەرتم...

بیرت بێت کە من بەڕێوەبەرتم...

بیرت بێت کە من لە سەروو تۆوەم...

بیرت بێت کە من سەرۆکی تۆم...

## پۆست پەرستی

لە سەردەمی مەنسوری خەلیفەی عەباسیدا، عەمارە بن حەمزە کە یەکێك بوو لە پیاوانی، پێگە و پایەیەکی زۆری لای خەلیفە هەبوو. رۆژێکیان کاتێك مەنسور پشتی دابوو بە کورسی خەلافەت و عەماریش لە پێگەیە باڵاکەی خۆیدا بوو، لەپڕ کەسێك لەناو ئامادەبووان هەڵسا و وتی: (ئەی خەلیفە من ستەملێکراوم).

مەنسور پرسیاری کرد: (چ کەسێك ستەمی لە تۆ کردووە؟) ئەو کەسە وەڵامی دایەوە: (عەمار ستەمی لێکردووم، چونکە خۆی کردووە بە خاوەنی موڵکەکەی من).

مەنسور روویکردە عەمار و وتی: (هەڵسە و لەگەڵ سکاڵاکەردا لە یەك ریز دابنیشە تا حوکم لەسەر هەردووکتان بدەم).

عەمار لە وەڵامدا وتی: (ئەم کابرایە ناتوانێ سکاڵاکەر بێت. ئەگەر موڵکەکە هی ئەوە، هیچ ناکۆکییەکم لەگەڵیدا نییە و ئەگەر هی منە بۆ ئەو وازی لێ دێنم و هەرچۆنێك بێت لەو شوێنە دەرناچم کە خەلیفە بە منی داوە و بۆ یەك پارچە زەوی ئەم پێگە شکۆمەندانەیە لەدەست نادەم.

## مرۆڤ بە پۆست گەورە نابێت

هێز سەنگ دەداتە ئەو جێگەیەی کە پاڵی پێوە دەدات، لاوازی سەنگی خۆی لەو ناونیشان و پێگەیە وەردەگرێت کە هەیەتی.

دەڵێن ئەسکەندەر یەکێك لە دەست وپێوەندە گەورەکانی خۆی گۆشەگیر کرد و پێگەیەکی نزم و سوکی دایە. پیاوەکە رۆژێکیان هاتە بەر دەرگا. ئەسکەندەر پێی گوت: (پێگەی خۆت چۆن دەبینیت؟)

وتی: (ژیانی شا درێژ بێت، پیاوەتی بە جێگەی گەورە نییە، بەڵکو جێگە بە پیاو شەریفانە و چاك دەبێ).

ئەسکەندەر کەیفی بەم قسەیە هات و ئیشەکەی بە کابرا دایەوە و پلەی بەرز و بەرزتری دایە.

**من بەو دڕکەی کە لە سەرەوەی دیوارەکەیە زانیم**

**کە ناکەس بە دانیشتن لە سەرەوە نابێتە کەس**

ئـەوانەی کـــە لاوازن هـــەڕەشـــــە دەکـــەن و

ئـــەوانەی کە لاوازترن مل بۆ هەڕەشـــە ئەدەن.

لـــــەکـاتی پەڕینەوە لـــە گۆمـــی لیخنی قوولْ،

پیســـی هەڕەشـــەی مەرگ لە مرۆڤ دەکـــــــات.

ئەو کـەســـەی کە مل ئەدات لە پیســـی کەمترە.

(نادر ئیبراهیمی)

## هەڕەشە و تۆقاندن

...مەلا چووە ناو گوندێکەوە. سەیریکرد چـەند کەسـێك دانیشـتوون. وتـی: (هـەر ئێستە نانم بۆ بێنن ئەگینا هەر ئەو کارەتان پێدەکـەم کـە بـە گوندەکـەی سـەرەوەم کرد).

دێهاتییـە سـاویلکەکان خواردنیـان بـۆ هێنـا. کاتێـك نانەکـەی خـوارد بـە تـرس و لەرزەوە لێیان پرسی: (زۆر باشە مەلا ئێستا پێمان بڵێ چیت بە گوندەکەی سەرەوە کرد؟) وتـی: (داوای خـواردنم کـرد نەیانـدامێ، ناچـار بـووم بێمـە گوندەکـەی ئێـوە. ئێوەش ئەگەر نانتان نەدابامایە دەچوومە گوندێکی تر).

سەرنج: لاوازی دەترسێت و ئەم ترسە لە قاڵبی ئەو هەڕەشە و توندوتیژیەدا بـەکار دەهێنێت دەردەخات. ئەو خۆی بە ناچار دەبینێ کـە بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئـەوانیتردا سوود لە چەکی زۆرداری و هەڕەشە و هەندێ جاریش بەکێشکردن وەرگرێت.

کاتێك کە مۆسۆلینی لە ترۆپکی هێز و مەزنایەتیدا بوو، شـەوێکیان ناچـار بـوو لـە هۆتێلێکی بچوکدا بمێنێتەوە، چونکە ئۆتۆمبێلەکەی شکابوو. ئەو بۆنەوەی کە چـەند سەعاتێك سەرگەرم بێت، بە جلی گۆڕاو و بەشێوەیەکی نەناسراو چووە سینەما.

کاتێك وێنەکەی لەسەر پەردەی سینەمای دەرکەوت هەموو تەماشاچیان هەڵسان، بەڵام ئەو هەر دانیشتبوو. بەڕێوەبەری سینەما کە ئەوی بەو دۆخەوە بینی هاتە پێشەوە و دەستی لەسەر شانی دانا و وتی:

(ئێمەش هەمان بڕوای تۆمان هەیە کە نابێت بە ڕێزگرتن لە خاوەنی ئەم وێنەیە لە شوێنی خۆمان هەڵسین. بەڵام وا باشترە کە وەکو تەماشاچییەکانی تر هەڵسیت، چونکە لەوانەیە لە زەبر و ئازاردانی سیخوڕانی نهێنیی مۆسۆلینی قوتار نەبیت!)



سیاسەتمەدار و دیکتاتۆری ئیتاڵی، دامەزرێنەر و رابەری حزبی فاشیستە. ئەو لە ساڵی ١٩٢٢دا دەسەڵاتی لە وڵاتەکەیدا گرتە دەست و لە جەنگی جیهانیی دووەمدا لەگەڵ هیتلەر یەکیگرت. پاش هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر ئیتاڵیا مۆسۆلینی حکومەتێکی لە باکووری وڵات پێکهێنا، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٣دا دەستگیر کرا و پاشان لەسێدارە درا.

لە ژینگەیەکدا کە لاوازی و سوکایەتی تیایدا زاڵە، ئێمە ئەم شتانەی خوارەوە بەدی دەکەین:

- ترس و تۆقاندن
- بەدگومانی
- ڕۆحیەی ڕەخنە قبوڵ نەکردن
- سنووربەندی و کۆت

جا فەرق ناكات ئەو ژینگەیە ماڵەوە، فەرمانگە، كۆمەڵگە یان لە ئاستی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكاندا بێت. لەم هەلومەرجەدا:

دایك و باوكان منداڵەكان سزا دەدەن. منداڵانیش دایك و باوكیان بە راكردن لە ماڵەوە، دڵدارەكان بە جیابوونەوە و سەرۆكەكان بە دەركردن و كارمەندەكان بە مانگرتن، مامۆستاكان بە نمرە نەدان و قوتابیان بە غایب بوون و وازهێنان لە خوێندن و حكومەتە لاوازەكانیش ئامرازی خۆیان هەیە...

**ئەو كەسەی كە بە ئامادەبوونت لە تۆ بترسێت. لە نەبوونتدا رقی لێتە.**

**(پەندی ئیتاڵی)**

كۆنفۆشیۆس بە پێدەشتی شاخێكدا رەت دەبوو. ژنێكی بینی كە لەسەر گۆڕێكدا گریە و زاری دەكات. بەرەو لای ئەو ژنە رۆیشت و (تسە لو)ی قوتابی ناردە پێشەوە تا قسەی لەگەڵ بكات.

(تسە لو) بەو ژنەی وت: (ناڵە و زاری تۆ وەكو هی كەسێكە كە خەمیان زیاد كردبێت).

ژنەكە لە وەڵامدا وتی: (وایە. جارێكیان بەورێك خەزوورمی لێرە كوشت. مێردەكەشم كوژرا و ئێستاش كوڕەكەم هەر بەم شێوەیە گیانی سپاردووە).

كۆنفۆشیۆس هاتە پێشەوە و وتی: (بۆچی لێرە ناڕۆیت؟)

ژنەكە لە وەڵامدا وتی: (لێرە ستەمكارێك حوكمڕانی ناكات).

ئینجا مامۆستا وتی: (منداڵەكانم، ئەوەتان بیر بێت كە حكومەتی ستەمكار لە بەور ترسناكترە).

**پەروەردگارە، من لە ستەمكاران رزگار بكە.**

**(القصص، ئایەتی ٣٨٨)**

تەنانــەت ئــەو کاتــەش کــە داوات لێدەکــەن
کەموکوڕییــەکانیان بــە ئاشــکرا دەرببڕیــت،
چاوەڕوانی پیاهەڵگوتن دەکەن.
(سۆمەرست مۆم)

# ڕەخنە قبوڵنەکردن

...ڕۆژێکیان حاکم شیعرێکی هەڵبەست و بۆ مەلا نەسرەدینی خوێندەوە. مەلا وتی: (شیعرێکی لاوازە).

حاکم زۆر زویر بوو و دەستبەجێ فەرمانیدا مەلا لە تەویلەدا بە ئاخوڕێکەوە بیبەستنەوە و شەو و ڕۆژێك بە برسێتی و بە تینوێتی بیهێڵنەوە. حاکم ڕۆژی دواتر بانگی کرد و شیعرێکی تری بۆ خوێندەوە و داوای بۆچوونی کرد.
مەلا بێ ئەوەی کە دەمی بکاتەوە مەجلیسەکەی جێ هێشت. حاکم بە توانجەوە وتی: (بۆ کوێ؟) مەلا لە وەڵامدا وتی: (تەویلە).

سەرنج: مرۆڤ خۆسەپێن و سوك لە ڕەخنە بێزارە. ئەو بە هیچ شێوەیەك ناکۆکبوون و بۆچوونی ناکۆك قبوڵ ناکات. ناکرێ لە گوڵ ناسکتری پێ بڵێیت. هەرچییەکی پێ بڵێیت بە توند بەری دەکەوێت. من ڕەخنەگرتن لە (لاوازی) بە پێ دانان لەسەر مین دەشوبهێنم. ئەوەندە بەسە کە بە (لاوازی) بڵێیت لەسەر چاوت برۆیە. ئەو ئەوەندە لە تووڕەییدا هەڵدەچێت و دەنگە دەنگ دەکات وەك بڵێیت ویستووتە بیکوژیت و یان گەورەترین درۆی دنیات خستووەتە پاڵی.
ڕۆژێکیان ئاغایەك چووە گوندێك. خەڵکی کۆبوونەوە. ئاغا پێیانی وت: (خەڵکینە چیتان دەوێ؟)

حەسەن وتی: (ئاغا، ئاو كوا؟ نان كوا؟ زەوی كوا؟ دەرمان كوا؟) ئاغا وتی: (ئافەرین كوڕم، فەرمان دەدەم بپرژێنە سەری).

ساڵی دواتر ئاغا چووەوە هەمان گوند. خەڵكی كۆ بوونەوە. ئاغا پێیانی وت: (خەڵكینە چیتان دەوێت؟)

كەس هیچی نەوت، هەموویان بێدەنگ بوون.

لەپڕ كەسێك لەناو خەڵكەكەدا هەڵسایە سەر پێ و وتی:

(ئاغا! ئاو كوا؟ نان كوا؟ زەوی كوا؟ دەرمان كوا؟ بە راست حەسەن ئاغا كوا؟)

لە رووبەری لاوازیدا هیچ دەنگێكی نەیار نابیسترێت. فەزای بە تەواوی یەكدەنگە. هەر ئاوازێكی ناكۆك بە خێرایی خامۆش دەبێت. هیچ بیركردنەوەیەكی ناكۆك ماف قسەكردن، رەخنە و دەربڕینی نییە.

..لە مەلایان پرسی: (وێڕای نەبوونی شارەزایەتی لە تیرهاوێژیدا چۆن چۆنی ئەو تیرەی كە بەری دەدەیت بەر ئامانجەكە دەكەوێت؟)

مەلا وتی: (ئەمە خۆ ئاسانە. یەكەم جار تیرەكە دەهاوم و پاشان دەچم بازنەیەكی بە دەوردا دەكێشم!)

ئاشكرایە كە هەموو ئەو كارانەی كە ئەنجامی دەدەین دروست نین، بەڵام كەسی خۆسەپێن دەیەوێ پیشانی بدات كە هیچ هەڵە و كەموكوڕییەكی نییە و هەرچییەك كە دەیكات دروستە. ئەو لەبری راستكردنەوەی هەڵەكانی، كات و وزەی زۆر دەخاتەكار تا بیسەلمێنێت ئەوەی ئەنجامی داوە راست و لە شوێنی خۆیدا بووە، چونكە ئەو خۆی بە پێوەری هەڵسەنگاندنی راستی لەقەڵەم دەدات. هەمیشە كەسی خۆسەپێن لەسەر حەقە. واتە لەبری ئەوەی كە خۆی لەگەڵ حەقیقەت بگونجێنێت، حەقیقەت لەگەڵ خۆیدا دەگونجێنێت!

**من ئیمپراتۆری رۆمم و دەبێ من لە بنەڕەتەوە دیاری بکەم کە چۆن ڕێزمان کردارەکان شی بکاتەوە.**

**(ئیمپراتۆر زیگسیموند)**

لە هەلومەرجێکی وەهادا ژینگە بۆ گەشەکردنی زمانلوسی و پیاهەلگوتن یاریدەدەر دەبێت. لەکاتێکدا کە لە رووبەری هێزدا بنچینەکە ئازادی دەربڕینە:

**سۆراخی هیچ ئاداب و ڕێسایەك مەکە**

**هەرچییەك دڵی تنگت دەیەوێ بیڵێ**

**(مەولەوی)**

لە ژینگەی لاوازیدا زمانلوسی زاڵ دەبێت:

**خۆش زمان بە لە ئەماندا بە**

**(پەندی فارسی)**

لەم رووبەرەدا پەیوەندییەکان نەك لەسەر بنەمای پەیوەندیی دڵ و ڕێزی دوولایەنە بڵکو لەسەر بنەمای ترس بونیاد دەنرێت. کەسەکان فێر دەبن بۆ هێنانەکایەی پەراوێزێکی ئاسایش و یان بەدەستهێنانی پایە و پارووی دەم بە زمانلوسی و مەدح و سەنا ئیش بکەن و لە دەربڕینی هەموو جۆرە ئیرادەیەك، بپرینگێنەوە.

پیاهەڵدان بە ترۆپکی راکردن لە واقیع هەژمار دەکەم، چونکە تاکەکەسی ماستاوچی واقیع بەو شێوەیەی کە هەیە نابینێت، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاوەژوو دەبینێت کە کەسی خۆسەپێن دڵی پێ خۆش بێت: دەگێڕینەوە کاتێك مامۆستای لوئەی چواردەهەم لە منالیدا وانەی کیمیای پێ گوتووە، دیدێکی وەها هەبووە:

(خاوەنشکۆ ئۆکسجین و هایدرۆجین بە شەرەفێکی گەورەی دەزانن کە لە حزوری موبارەکی جەنابتاندا لەگەڵ یەکتریدا یەکبگرن و ئاو بهێننە کایەوە).

**کەسێك کە بە تۆدا هەڵبڵێت لەبارەی شتێکەوە کە لە تۆدا نییە، خۆی لێ بەدوور بگرە کە زەمیشت دەکات لەبارەی ئەوەی کە لە تۆدا نییە.**
**(فەرموودە)**

## پیاهەڵدانی شاعیرانە

...رۆژێکیان مەلا بەپەلە دەچووە تەعزیەی حاکم. یەکێك لە هاورێکانی لێی پرسی: (بۆ کوێ دەچیت؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (من لە سەفەر بووم، تازە گەیشتووم. ئێستا بیستوومە کە دایکی حاکم کۆچی دوایی کردووە). هاورێکەی وتی: (بەندەی خودا، تۆ بە هەڵەداچوویت، خودی حاکم مردووە). مەلا بە بیستنی ئەم هەواڵە بە خێرایی رێگای ماڵەوەی گرتەبەر، هاورێکەی وتی: بۆ کوێ؟

مەلا وتی: (ویستم بچمە تەعزیە کە حاکم بمبینێت، بەڵام ئێستا کە خۆی مردووە بچم تا دایکی بمبینێت.)

**کەسێك کە متمانەی بە خۆی هەیە پێویستی بە پیاهەڵدانی ئەوانیتر نییە.**
**(گوستاڤ)**

١ ٢٠٠/

## خەیاڵکردن

...مەلا سواری کەر ببوو و گوریسی بزنەکەی کە زەنگوڵێکیش بە گەردنییەوە بوو بە کلکی کەرەکەیەوە بەستبوو و لە بازاڕ دەگەڕایەوە. سێ دز ئەویان بینی. یەکێکیان وتی: من بزنەکەیم دەوێت. دووەمیان وتی: منیش کەرەکەیم دەوێت. سێیەمیان وتی: جلەکانی بۆ منە.

دزی یەکەم گوریسی بزنەکەی کردەوە و زەنگوڵەکەی بە کلکی کەرەکەوە بەست و بزنەکەی لەگەڵ خۆیدا برد. دووەمیان هاتە پێشەوە و وتی: (خەڵکی زەنگوڵ بە گەردنی کەرەوە هەڵدەواسن، لەکاتێکدا کە تۆ بە کلکیەوە بەستووتە!)

مەلا گەڕایەوە و سەیری کرد بزنەکەیان بردووە. هاواری کرد: (کێ بزنەکەی منی بردووە؟) دزەکە وتی: (پێش چەند خولەکێك پیاوێکم بینی کە بزنێکی بە پێش خۆی دابوو و چووە ناو ئەو کۆڵانەوە).

مەلا لە کەرەکەی هاتە خوارەوە و تکای لەو پیاوە کرد کە ئاگای لە کەرەکەی بێت تا ئەو بچێت بەدوای بزنەکەیدا. کاتێك دزەکە بینی مەلا دوور دەکەوێتەوە، سواری کەرەکە بوو و بۆی دەرچوو.

لەبەرئەوەی مەلا دزی بزنەکەی نەدۆزییەوە، گەڕایەوە و سەیریکرد کەرەکەشی دیار نەماوە. لەو نزیکانە کەسێکی بینی کە لەسەر بیرێك دانیشتووە و خەریکی گریانە.

مەلا پرسی: (بۆچی دەگریت؟)

ئەو پیاوە وتی: (سندوقە بچوکە ئاڵتونییەکەم بۆ حاکم دەبرد کە کەسێك پاڵی پێوە نام و سندوقەکە کەوتە ناو بیرەکەوە. لەبەرئەوەی خۆم ناوێرم، سەد دینار دەدەمە هەر کەسێك کە بچێتە ناو بیرەکە و دەری بێنێتەوە. مەلا حسابی کرد پارەی زیاتر لە هی کەر و بزنەکەی دەست دەکەوێت. بۆیە جلەکانی داکەند و چووە ناو بیرەکە. بەڵام چەندەی گەڕا هیچ شوێنەوارێکی سندوقەکەی بەدی نەکرد و لە قووڵایی بیرەکەوە هاواریکرد کەس وەڵامی نەدایەوە.

ناچار بە زەحمەتێکی زۆرەوە لە بیرەکە هاتە دەرەوە. تەماشای کرد جلەکانی دیار نەماون. زانی کە ئەو کەسە پلانی دزینی جلەکانی دانابووە. بۆیە دارێکی دەستدایە و لەکاتێکدا بە دەوری سەریدا دەیسووڕاند، بەناو کۆڵانەکەدا ڕۆیشت. لێیان پرسی: (ئەوە چ کارێکە تۆ دەیکەیت؟)

وتی: (بۆ ئەوەمە کە نەمبەن، ئاخر کەر و بزن و جلەکانیان بردووم).

**سەرنج**: ئەوەندە بەسە کە یەك جار زەبرمان بەر بکەوێت. بۆ نموونە یەك جار لە خۆشەویستیدا شکست بێنین یان شەریکەکەمان کڵاومان لەسەر بنێت، درۆمان لەگەڵ بکەن و یان لە شارێکدا ڕەفتاری خراپمان لەگەڵدا ئەنجام بدەن. ئەو کاتە بە ڕق و ڕاکردنەوە لە خەڵك، تێڵای بێ متمانەیی هەڵدەگرین و بەسەر سەرماندا دەیسووڕێنین و چیتر ڕێگە بە کەس نادەین لێمان نزیك بکەوێتەوە. ترس و بێ متمانەیی، ئێمە لەوانیتر جیا دەکاتەوە، چونکە لە کەوتنە ژێر چاودێری، خراپ بەکاربران و کەوتنە ژێر هێرش دەترسین. نیگەرانی ئەوەین کەسایەتی و شتەکانمان زیانیان پێ بگات.

خاڵی جێ سەرنجی ڕەشبینی ئەوەیە کە لەبری ئەوەی دوای هەر ناهەموارییەك کە لەلایەن ئەوانیترەوە ئەزموونی دەکەین، بە وریایی و هۆشیارییەوە ژیانمان درێژە پێبدەین، بە بەدگومانییەکی ڕەهاوە گۆشەگیری هەڵدەبژێرین و ئەوانیتر بە چاوی دز و نەیار دەبینین و بڕوامان وا دەبێ کە هەموویان نموونەی خەروارێکن:

...مـەلا دوو بزنـی هـەبوو. یـەکێکیان رایکـرد لێـی و ئـەو هەرچـەندەی رایکـرد نەگەیشت ئاژەڵەکە. گەڕایەوە و کەوتە گیانی بزنە داماوەکەی تر. هاوڕێیەك گەیشت و پێی وت: (مەلا بۆچی لەو بەستەزمانە ئەدەیت؟)

مەلا وتی: (تۆ نازانیت! ئەگەر ئەمەش نەبەسترایەتەوە لەویتر خێراتر رایدەکرد).



**هەمیشە لە باشیی مرۆڤەکان دیوار بۆ خۆت دروست بکە. هەر کاتێك خراپـەیان بەرانبـەر کردیت، تەنیا خشتێك لە دیوارەکە لا ببە. بێ ویژدانییە ئەگەر دیوارەکە بڕوخێنیت.**

## خۆسەپێنی و رەشبینی

خۆسەپێن هەمووان لەسـەر دیـنی خـۆی دەبینێت. (کـافر هـەموان لەسـەر دیـنی خۆی دەبینێت).

**هەمیشە ئەوەی کە لەناو ناخی تۆدایە، لەوانیتردا دەیبینیت.**

دیوارێك بـە دەوری خۆیـدا هەڵدەچـنێت و هـەرگیز رێگـە نـادات کەسـێك لـێ نزیـك بکەوێتەوە. ناتوانێ متمانە بەوانیتر بکات. هەمووان بەو دز و جەردەیە دەبینێت کـە بیر لە هەڵکوتانەسەر و رووتکردنەوەی دەکەنەوە. هەمووان دەیانەوێ ئەو لـەو پێگـە

و پایەیەی کە پاڵی پێداوە بخەنە خوارەوە. حەز لە کۆنترۆڵکردن و ترس لە کۆنترۆڵکران ئەو دەخاتە حاڵەتێکی بێ قەراری و نائارامیی بەردەوام.

(بەڵام جان ڤاڵجان لە تاریکاییدا بوو، مۆمدانەکەی بە دەستەوە بوو، بێ جوڵە و ترساو دوور لە پیرەمێردە نورانییەکە وەستابوو. هەرگیز شتێکی بەو جۆرەی نەبینیبوو. ئەم متمانەیە ئەوی دەخستە ناو ترسەوە. دنیای ئەخلاق نمایشێکی لەوە گەورەتری نییە. ویژدانێکی خەوشدار و شڵەژاو، لە لێواری ئەنجامدانی کردارێکی دزێو و سەرقاڵی تەماشاکردنی خەوی پیاوێکی چاکەکار...)

لە چیرۆکی بێ نەوایاندا، کاتێك جان ڤاڵجانی تاوانکار پەنا دەباتە بەر ماڵی ئوسقوفێك، ئوسقوف قبوڵی دەکات و رێگە دەدات شەو لەوێ بمێنێتەوە.

## رەگ و ریشەکانی متمانە و بێ متمانەیی

هەروەکو دەزانن، جان ڤاڵجان متمانەی ئوسقوفەکە خراپ بەکار دەبات و دەفرە مسەکان هەڵدەگرێت و لەوێ رادەکات. پۆلیس دەستگیری دەکات و دەیانگەڕێنێتەوە بۆ لای ئوسقوف. ئوسقوف نکوڵی لە دزییەکەی ئەو دەکات و بۆ رزگارکردنی لە دەستی پۆلیس، دەڵێت:

(ئاه! تۆ گەڕایتەوە؟ بە بینینیت زۆر خۆشحاڵم. بەڵام ئەرێ بە راست، من مۆمدانەکانیشم دابووە تۆ کە ئەوانیش مسن و دەتوانیت دووسەد فرانکیان لێ بەدەست بێنیت. ئەی بۆچی ئەوانیشت نەبرد بیانفرۆشیت؟)

**گومانکردن لە دۆست خراپترە لە فریوخواردن بە دەستی دۆست.**

هێـزی عەشـق وەهایـە. بۆچـی ئوسـقوف متمانـەی بـە جـان ڤاڵجـان کـرد و ئـەوی پەسەند کرد؟ لاوازی ئەو کاتە متمانە دەکات کە متمانـە بـە لایـەنی بەرانبـەر بکـات. بەڵام هێز پێویستی بە متمانەکردن نییە، چونکە بـێ پێویسـتییە و بـێ پێویسـتی وا لێدەکات زیانی پێنەگات. هێز خـاڵی لاوازی نییـە، هێـز هیچـی ناوێـت. ئـەو ئەوەنـدە کاملە کە شتێك لە قاموسیدا نییە بەناوی لەدەستدان و کێماسی و بەتاڵی.

بۆچی بـەدگومانین لـە متمانـەی ئـەوانیتر؟ نیگـەرانین لـە زەبـر بەرکـەوتن و زیـان پێگەیشتن...دەترسین شتێکمان لێ کەم بێتەوە، باج و تێچوونێك بکەوێتە سـەرمان. ئەگەر لەم ترسانە دەرباز ببین و خۆمـان بـە رکێفنـەکراو ببیـنین، دەتـوانین متمانـە بەوانیتر بکەین و بە گیانێکی کراوەوە قبوڵیان بکەین.

**کاتێك پێویستت بە متمانەکردن بەوانیتر نییە، دەتوانیـت متمانـەیان پێ بکەیت و کاتێك پێویستت پێیان نییە کە بێ پێویستی بیت.**

ڕەشبین ئەو کەسەیە کە کاتێك لێی دەپرسیت:
(چۆنی؟) لە وەڵامدا دەڵێت: (ئەوە خۆتی!)

## بەدگومانی

...نیوە شەو بوو مەلا لە خەوێکی قووڵدا بوو کە بنمیچی خانووەکەی داڕما. خانووەکە زۆر کۆن بوو و ئەوەندە رزیبوو کە چیتر گونجاو نەبوو بۆ تیا نیشتەجێبوون و لە راستیدا ببووە وێرانە.

مەلا هیچ شوێنێکی نەبوو بۆی بچێت. لەپڕ بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات. دەیتووانی بڕوات و ماوەیەك لەگەڵ کوێخای دێ بژیت کە هاوڕێی بوو. ئەم بیرۆکەیە تا ماوەیەك ئاسودەیی پێ بەخشی. بەڵام لەپڕ بیرۆکەیەکی تر هێرشی بۆ هێنا: لە چ شتێك ئەوەندە دڵنیایت؟ لەوانەیە کوێخا داواکەی تۆ قبوڵ نەکات. مەلا بە گەرم و گوڕییەوە رووبەڕووی ئەم بیرۆکەیە بووەوە و لەبەر خۆیەوە وتی: (بۆچی ئەو قبوڵم نەکات؟ دواجار هەرچییەك بێت ئەوە من بووم کە لە دروستکردنی خانووەکەیدا یارمەتیم دا. حەتمەن ئەمەش کەمترین کارە کە دەتوانێت بۆ منی ئەنجام بدات).

ئەم بیرۆکانە ئارامی کردنەوە، بەڵام دوای خواردنی نانی شەو دووبارە ئەم بیرۆکەیە لە کەللەی دایەوە: (وایدابنێین کە داواکەت رەفز دەکاتەوە!...بۆچی دەبێ بڵێت نا؟ ئەو بۆ هەموو ئەو شتانەی کە هەیەتی قەرزاری منە. ئەوە من بووم لە تەنگانەدا یارمەتیمدا. ئەوە من بووم کە ئەوم بە خێزانەکەی هاوسێمان ناساند تا کچەکەی ئەوان بخوازێت و ئەو کچە سێ کوڕی هێنایە دنیاوە کە بوونە هۆی شانازی. ئایا هیچی تیایە بۆ ماوەی هەفتەیەك تەنیا ژوورێکم بداتێ؟ نا ئەمە ئەستەمە).

بەم ڕێنماییانە مەلا دووبارە ئارام بووەوە و ڕێگای مـاڵی کوێخـای گرتەبـەر. بـەڵام دیسان هەمان بیرۆکە لە کەللەی دایـەوە: (بـەڵام وایـدابنێ ئـەو ڕەفـزت بـداتێ. ئـەی دوایی چی دەکەیت؟)

ئەم پرسە بۆ مەلا زۆر تەحەمولنـەکراو بـوو: (بـە نـەفرەت بیـت! چـۆن دەتـووانێ وەڵامـی ڕەفـزم بـداتێ). لەکاتێکـدا کـە زیـاتر و زیـاتر تـوڕە دەبـوو لەبـەر خۆیـەوە دەیگوت: (ئەگەر کوێخا ئەمڕۆ زینـدووە بـەهۆی ئەوەوەیـە کـە مـن لـە تەمـەنی سـێ ساڵیدا ڕزگارم کرد لە خنکان، واتە ئەوەندە بێ ئەمەکە کـە لـەم هـەوا سـاردەدا مـن بەبێ جێگە و ماڵ و حاڵ وێڵ بکات؟)

بەڵام ئەو بیرۆکەیە، پێیەوە نوسابوو: (تەنیا وایدابنێ!)

مــەلای بێچــارە ئەوەنــدەی دەیتــوانی ڕووبــەڕووی بیرکردنەوەکــەی بــووەوە. سەرەنجام گەیشتە بەر دەرگای کوێخا. لە دەرگاکەیدا. کوێخا لە چـاوی خـەواڵووەوە دەرگای کردەوە و بە سەرسوڕمانەوە وتی: (مەلا، چی بووە؟ چ شـتێك بـەم دەمـەی شەو تۆی گەیاندووەتە ئێرە؟) مەلا کە بایی پێویست توڕە بـوو نـەیتووانی خـۆی لـە هاوارکردن بپارێزێ و لە وەڵامدا وتی: (ئێستا پێت دەڵێم چ شتێك بەم ناوەختـە مـنی گەیاندووەتە ئێرە! ئەگەر پێت وایە من داوات لێ دەکەم تەنیا ڕۆژێك لـە مـاڵی خـۆت جێ بکەیتەوە، دەبێ بڵێم لـە هەڵـەدایت! مـن هـەرگیز نامـەوێ خـۆت و ماڵەکـەت و ژنەکەت و خێزانەکەت کارێکم بۆ بکەن! هەمووتان بڕۆن بۆ دۆزەخ!)

و پاشان گەڕایەوە و لەوێ دوور کەوتەوە...

**من هێڵـی تەلـەفۆنی ئـەقڵم بـە بـەردەوامی بـۆ هـێمنی، گونجـان، سەلامەتی و عەشق تەرخان کردووە، بۆیە کاتێك گومان، شـڵەژان و یـان تـۆقین ژمارەکـەم وەردەگـرن هەمیشـە زەنگـی مەشـغوڵ گوێبیست دەبن و زۆر زووش ژمارەکەمیان بیر دەچێتەوە.**

کێیە مەولا ئەو کەسەی ئازادت بکات
کۆتـــی بەندەییت لە پێ دەر بکات
(مەولەوی)

## ئازادی

...ڕۆژێکیان بـاوکی مـەلا ئـەرکی ئـەوەی پـێ سـپارد کـە کەروێشـکێك بگەیەنێتـە کەسێك لە گوندەکەی دراوسێ. مەلا لەبەر خۆیەوە وتی: (وا باشـترە ناونیشـانی ئـەو کەسە بنووسم تا بـیرم نەچێتەوە). ناونیشـانەکەی خسـتە گیرفـانی و چـووە شـوێن ئەرکەکـەی. چـەند خولـەك جارێـك سـەیری دەکـردەوە و لەبـەر خۆیـەوە دەیگـوت: (دەزانم دەبێ بچمە کوێ). هەموو شتێك بە باشی بەڕێوە دەچـوو تـا ئـەوەی کـە لـە ڕێگەدا کەری مەلا پێی پێچی کرد و ئەو و کەروێشکەکەی دا بە زەویدا. کەروێشـکەکە رایکرد. مەلا وەستا و دەستیکرد بە پێکـەنین. ڕێبوارێـك کـە لـەوێ رەت دەبـوو لێـی پرسی: (بە چی پێدەکەنیت؟) مەلا لـە وەڵامـدا وتـی: (بـەو کەروێشـکە دەبەنگـە کـە رادەکات. ئەو نازانێ بچێتە کوێ چونکە ناونیشانەکە لە گیرفانی مندایە).

**سەرنج: مەرج نییە ئەو ئادرێسەی لە گیرفانی مندایە ئـەوانیتر بگەیەنێتـە مـەنزڵ.**
ئەگەر باوەڕ ناکەیت ئەوانیتر ئازاد بکە و بزانە ئامادەن شوێن تۆ بکەون یان نا.

**تاقیکردنـــەوەی ڕێبەرایەتی:بگـەڕێرەوە دواوە و بزانــە کــەس بــە شوێنتەوەیە (جۆن.سی.ماکسوێل)**

بۆچـی دەمانــەوێ دەوروبــەر کـۆنترۆڵ بکــەین و بەســەریاندا زاڵ بـین؟ چـونکە پێویستمان پێیانە. پێویستیی سۆزی و مـادی. چـەندەی لـە رووبـەری پێویسـتبوون

دوورتر بکەوینەوە لە دەسەڵاتخوازی دوورتر دەکەوینەوە و ئازادی و مافی هەڵبـژاردنی زۆرتر دەدەینە ئەوانیتر.

هێز پێویستی بە کـەس نییـە، بۆیـە هـەمووان سەربەسـت دەکـات تـاوەکو هـەموو کەسێك بە مەیل و ئیرادەی خۆی رەوتی ژیانی هەڵبژێرێت. ئەوە هەڵبژێرێت بـۆ کـوێ دەچێت، چی لەبەر بکات، لەگەڵ کێدا هاوسەرگیری بکات، چ پیشەیەك بگرێتە بـەر و چ ئامانجێکی هەبێت و...

هێز نیگەرانی ئەوانیترە. ئەو حەز دەکات یارمەتی هەمووان بدات:

که بینیت نابینایەك و چاڵێك هەیە گەر کپ دانیشیت گوناهت هەیە

کارێن هۆرنای دەڵێت: (ئارەزوو بـۆ ملکەچـپێکردنی ئـەوانیتر هەمیشـە راسـتەوخۆ نییە، بەڵکو هەندێ جار لەژێر ناونیشانی پـەروەردە، ئامۆژگاری، خێرخوازی، رێنمایی و دڵسۆزیدا مەیسەر دەبێت).

هێز نایەوێت بەزۆر ئەوانیتر بباتە بەهەشت. هێز وەکو تابلۆکـانی هاتوچـۆ رەفتـار دەکات. رێنمایی پێویست بۆ رێبواران دەخاتەڕوو، بـەڵام ناچـاریان ناکـات رێگایـەکی دیاریکراو بگرنە بەر.

بـە پێچــەوانەی روانگــەی ئازادیخوازانــەی هێــز، لاوازی پــەیامهێنی کۆیلایــەتی و زیندانە. پێویستییە مادیەکانی دەبێتە هۆی ئەوەی کە بۆ گەیشتن بە بەرژەوەنـدی و چڵێسییەکانی وەکو ئامێر بڕوانێتە مرۆڤـەکان. ئـەو دەیـەوێ ئـەوانیتر بگـەوجێنێت و جڵەویان بکات.

**سیاسەتمەدار مرۆڤەکان دەکاتە دوو پۆل: ئامراز و دوژمن**

**(لویی سالیسابوری)**

لەلایەکی ترەوە، پێویستییە سۆزییەکانی لاوازی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو بیەوێ ببێتە خاوەنی دەوروبەری. ئەو بە رواڵەتێکی عاشقانە بانگەشەی ئەوە دەکات کە مرۆڤەکانی خۆش دەوێت. بەڵام خۆشەویستییەکەی خۆپەرستانەیە. ئەو ئەوانیتری لەبەر خۆی نەك لەبەر خۆیان خۆش دەوێت.

**لە عەشقی راستەقینەدا، تۆ (باشی و خێری)ی ئەوانیترت دەوێ، بەڵام لە عەشقی سۆزیدا تۆ ئەوانیترت دەوێ.**

**(مارگرێت ئەندرسن)**

ئەگەر دەترسیت کەسێك لەدەست بدەیت، عاشقی ئەو نیت، ئەوت لەو شتەدا سنووربەند کردووە کە بە عەشق ناوی دەبەیت. ئەگەر تۆ بە کەسێك دەڵێیت بێ ئەو ناتووانیت بژیت، عاشقی ئەو نیت، بەڵکو داوای هەموو شتەکانی لێدەکەیت. بۆیە نابێ لەدەستی بدەیت.

**گەر تۆ هەبیت دەتووانم سەدساڵ بێ گیان بژیم**

**بێ تۆ گەر سەد گیانیشم هەبێ ساتێك ناتووانم بژیم**

هەموو رەشبینییەکان، بەدگومانییەکان، کۆنترۆڵکردنەکان، ئیرەییەکان و رکابەرێتییەکانیش لێرەوە دەست پێدەکەن.

**بە سێبەر تۆم ناوێ عەشق هەیە و هەزار بەدگومانیش**

## غیرەکردن

شەوێکیان پێش زەماوەند، زاوا بە بوکێی وت: (دەبێت خاڵێکت بیر بخەمەوە. من بەبێ هیچ هۆکارێك غیرەی زۆرم هەیە). بوکێ وتی: (نیگەران مەبە. لە ژیانتدا لەگەڵ من هۆکاری زۆرت دەبن بۆ ئەم هەستکردنەت).

## لە بەکێشکەری عەشقەوە تا پاڵنەری لاوازی

...کچی کوێخا بە دایکی وت: (نامەوێ ببمە ژنی مەلا، ئەو بێ باوەڕە و بڕوای بە قیامەت نییە. دوێنێ بیستم کە دەیگوت دۆزەخێك لە ئارادا نییە). ژنی کوێخا وتی: (قەیناکات. تۆ ببە بە ژنی، دوای مانگێك بە کرداری بۆی دەردەکەوێ کە بەهەڵەداچووە و باوەڕ بە هەبوونی دۆزەخ دێنێت).

سەرنج: ناڕوونییەکان، خۆپەرستی و خۆسەپێنییەکانی لاوازی دۆزەخێکی لێ دروست دەکات کە هیچ کەسێك حەزی لێ نزیك کەوتنەوەی نییە. مرۆڤی خۆسەپێن ناچێتە دۆزەخ، بەڵکو دۆزەخ لەگەڵ خۆیدا بۆ ئێرە و ئەوێ دەبات.

### خوی چاکە تۆ دەکاتە شێر     خوی خراپە دنیات لێ دەکات تێر

هێز جوان و بەکێشکەرە. هێز بێ ئەوەی کە بیەوێت لەپێناو ئەو عەشق و ئازادییەی کە لە هەناوی خۆیدا هەیەتی کەسەکان لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە. جیاوازیی هێز و لاوازی ئەمەیە: هێز بەدوای ئەوەدا وێڵ نییە کە بەسەر ئەوانیتردا زاڵ بێت، بەڵام بەهۆی جوانی و بەکێشکردنەکەی، هەمووان تامەزرۆیانە پەیڕەوی

لێدەکەن و لاوازی دەیەوێت بەسەر ئەوانیتردا زاڵ بێت، بەڵام هەمووان لەبەری رادەکەن.

**هەندێ کەس شوێنەکە بە ئامادەبوونیان دەڕازێننەوە و هەندێکی تر بە جێ هێشتنی، شوێنەکە جوان دەکەن.**

**(مارك تووەین)**

وێڵ مەبە بەدوای فێربوون و سوودوەرگرتن لە شێوازەکانی زاڵبوون بەسەر ئەوانیتر و رێگاکانی کاریگەری خستنەسەر ئەو کەسانەی کە پەیوەندیت لەگەڵیاندا هەیە، سەرنجڕاکێش بە تا هەمووان بەرەو لات بێن.

## پاڵنەری لاوازی

...یەکێك لە ئەمیران بە مەلا نەسرەدینی گوت: (لە سەردەمی خەلیفەکانی عەباسیدا وا باو بوو کە خەلیفەکان، شاکان و ئەمیرەکان هەریەکەیان نازناوێکیان هەبوو کە بە الله کۆتایی دەهات. بۆ نموونە موەفەقولڵا، متوەکل علی الله، موعتەسیم بالله...بە بۆ چوونی تۆ چ نازناوێك شایستەی منە؟)

مەلا نەسرەدین وتی: ( باشترین نازناو بۆ تۆ نعوز بالله یە).

## خوداوەند ئازادی هێنایە کایەوە و مرۆڤ بەندایەتی

-مرۆڤێك كـە مـافی دەربـڕینی عەقیـدە و بیرکردنـەوەی نـەبێت، بـە بوونـەوەرێکی زیندوو لە قەڵەم نادرێت.

**(مۆنتسکیۆ)**

-من دوژمنی تۆ و عەقیدەی تۆم، بەڵام ئامادەم لـە ڕێگـای ئـازادیی عەقیدەکەتـدا گیانی خۆم فیدا بکەم.

**(ڤۆلتێر)**

-من ئەگەر لە بەهەشتدا بم، بەڵام پێم بڵێن: مافی ئەوەت نییـە دۆزەخ بەسـەر ئـەم بەهەشتەدا هەڵبژێریت، لەو بەهەشتە دەچمە دەرەوە. (ژان ڕۆستان)

**ئـاوەدانیی مەملەکـەتێك بـە پێـی ئاسـتی ئازادییەکـەی هەڵدەسەنگێنن، نەك بە گوێرەی بەروبوومەکەی.**

**(مۆنتسکیۆ)**

-لە هەر کوێیەك ئازادی هەبێ، ئەوێ نیشتمانی منە.

**(ئارتۆر شۆپنهاوەر)**

-من بە تەواوی لایەنگیری ئازادی رادەربڕینم، بەو مەرجـەی کـە بـە تونـدی لـەژێر کۆنترۆڵدا بێت!

**(ئالین بێنێت)**

-گەورەترین سامان میللەتێك ئازادییە.

**(لۆردی گەورە)**

-یان ئازادیم بدەنێ یان مەرگ.

**(پاتریك هێنری)**

ئەگەر زنجیرێك بکەیتە ملی کەسێکی تر، ئەوا
سەرەکەی تری لە گەردنی خۆت گیر دەبێت.
(رالف والدو ئیمێرسن)

## لە ئازادییەوە تا ئازادبوون

...مەلا خەریکی ئەوە بوو مانگاکەی بباتە کێڵگە. پەتێکی بە ملی مانگاکە بەستبوو و سەرەکەی لە دەستی دابوو. ئەو لە رێگەدا رێکەوتی گروپێکی ئەهلی دڵی کرد کە لە سەفەردا بوون. یەکێکیان بە بینینی مەلا وتی: (ئایا مانگا بە تۆوە بەستراوەتەوە یان تۆ بە مانگاکەوە بەستراویتەتەوە؟)

مەلا دەستبەجێ وەڵامی دایەوە: (مانگاکە بە منەوە بەستراوەتەوە، بۆچی دەبێ من بە مانگاکەوە بەسترابێتمەوە؟) لەم بارەدا کەسەکە پەتەکەی لە ملی مانگاکە کردەوە و ئازادی کرد و مانگاکە دەستبەجێ رایکرد. مەلا سەری سورمابوو، بەڵام کاتی بەفیڕۆ نەدا و بەدوای مانگاکەدا رۆیشت. ئەو کەسە وتی: (مەلا پێی وایە مانگاکە لە دەستی ئەودایە، لەکاتێکدا کە خۆی لە دەستی مانگاکەدا بەندە).

**سەرنج:** ئێمە خاوەنی مانگای دارایی خۆمانین یان شتەکانمان خاوەنداریێتیمان دەکەن؟ لە زۆر رووەوە کاتێك داوا لە کەسێك دەکەن کە پێڕستی داراییەکانی بنووسێ، لە راستیدا خەریکی نووسینی ئەو شتانەیە کە خاوەنی ئەون.

**ئەگەر سامانی تۆ بۆ تۆ نەبوویێت، تۆ بۆ ئەو بوویت. نە تۆ بۆ ئەو دەمێنیت و نە ئەویش بۆ تۆ. کەواتە سوود لە داراییەکەت وەربگرە پێش ئەوەی کە ئەو سوودی لە تۆ وەرگرتبێت.**

**(ئیمام حسێن (س.خ) )**

ئازاد کەسێکە کە لەژێر دەسەڵات و کۆیلایەتیدا نەبێت و ئازادبوو کەسێکە کە بە شتەکان و داراییەکەی ئاڵودە نەبێت.

دەربازبوون لە کۆتی نەفس، چاوچنۆکی و چڵێسی، ئازادبوونە.

**ئەو کەسەی کە خاوەنی نەفسی خۆیەتی، ئازاد نییە.**

**(ئەپیکتیتۆس)**

ئازادبوونی تاك ئازادیخواز دێنێتە کایەوە، دوور لە هەر جۆرە ئارەزوویەکی دەسەڵاتخوازی و زاڵبوون بەسەر ئەوانیتر بە مەبەستی تێرکردنی پێویستییە کەسییەکان.

ئەو کەسەی کە لە دنیای ناوەوەدا دەستی بە ئازادبوون گەیشتبێت، ئازادی بۆ هاوتاکەشی دێنێتە کایەوە.

ئەو کەسەش کە لە بەندی ئاوات و نەفسانیەتیدا گرفتارە، ئازادیی ئەوانیتر سنووردار دەکات.

سامان هی کەسێك نییە کە هەیەتی، بەڵکو هی
کەسێکە کە چێژی لێ دەبینێت.

## جیاوازیی نێوان سامان و پارە بزانە

...مەلا نەسرەدینی پیسکە هەرچییەك کە هەیبوو فرۆشتی و کردی بە ئاڵتون. ئەو لە چاڵێکدا شاردنییەوە. بەردەوام دەچووە سۆراخیان و لێیان ورد دەبووەوە. ئەم کارەی ئەو، نیشانەی پرسیاری لای یەکێك لە نۆکەرانی وروژاند.

غولامەکە کە زانیبووی گەنجینەیەك لە چاڵەکەدا شاردراوەتەوە، کاتێك مەلا لە ماڵ چووە دەر، چوو و ئاڵتونەکانی هەڵگرت. کاتێك مەلا نەسرەدین گەڕایەوە، چووە سۆراخی چاڵەکە، سەیریکرد بەتاڵە. دەستیکرد بە شیوەن و زاری و قژەکانی دەرهێنا و دای لە دەم و چاوی خۆی. یەکێك لە دراوسێکانی پاش ئاگاداربوونەوە لە بەسەرهاتەکە پێی وت:

(خۆت نارەحەت مەکە، بەردێك بخەرە ناو چاڵەکە و وا بزانە ئاڵتونە، چونکە ئەگەر کەڵکی لێ وەرنەگریت، بەردیش وەکو ئاڵتونەکانی تۆیە و ئیتر جیاوازییان نییە).

**سەرنج:** بەهای هەر شتێك، لە هەبوونیدا نییە، بەڵکو لە کەڵك لێوەرگرتنیدایە.

ئێمە نەك بە ئەندازەی داراییەکانمان، بەڵکو بە ئەندازەی سوودوەرگرتنمان لێیان و ئەو چێژەی کە لێیان دەبینین، دەوڵەمەندین. لە بنەڕەتدا سامان چەمکێکی هەمەکی و قووڵترە لە پارە.

کەسانێکی دەوڵەمەندیش هەن کە سامانیان نییە. پارە بەشێکە لە زاراوەی خاوەن سامانبوون.

# پێناسەی سامان

**بڕوابەخۆبوون سامانە**

کەسانی بەتوانا لەبەرئەوەی بڕوابەخۆبوونیان هەیە، بەتوانا دەبن. بەڵام کەسانی لاواز لەبەرئەوەی پارەیان هەیە، هەست بە بڕوابەخۆبوون دەکەن.

**تەندروستی سامانە:**

**ئازایەتی سامانە:**

**ئەو کەسەی کە پارەی خۆی لە دەست بدات دۆڕاوە، بەڵام ئەو کەسەی کە بوێری خۆی لەدەست بدات مایەپوچە.**

**وزەی پێگەیشتوویی و ئەفرێنەرێتی سامانە:**

**پارە هەرگیز نابێتە هۆی هێنانەکایەی ئایدیا. ئایدیایە کە پارە دێنێتە کایەوە.**

**(دەبلیو جەی کامیرۆن)**

هەبوونی ئامانج، پلان و ئایدیاڵ سامانە.

**هەژارترین کەس، کەسێك نییە کە پارەی نییە، بەڵکو کەسێکە کە هیچ خەونێکی نییە.**

**(دەیڤد هال)**

هاوڕێیەتی و پەیوەندییە مرۆییەکان سامانن:

**دەوڵەمەنترین مرۆڤ لە دنیادا کەسێك نییە کە ئەو یەکەمین دۆلارەی کە بەدەستی هێناوە هێشتا هەیەتی، بەڵکو کەسێکە کە هێشتا دڵسۆزترین هاوڕێی پاراستووە.**

**(مارتا تامسن)**

سوودوەرگرتنی کاریگەر لە کات، سامانە:

**دەوڵەمەندبوون، واتە هەبوونی پارە و سامانداربوون واتە هەبوونی کات.**

**(ستیفان سوبید)**

**باشبوون سامانە:**

**بە چ حەقێك حورمەتی وشەی سامان دادەبەزێنیت کە لە بنەڕەتدا بە مانای (مرۆڤی باش و خاوەن فرەیی) دێت تەنیا بەو شتانەی سنووردار دەکەیت کە تەنیا بە پارە هەڵدەسەنگێنرێن .**

**(جۆن راسکین)**

وابەستەنەبوون بە پارەوە سامانە:

**ئەو کاتە دەگەیتە ترۆپکی سەرکەوتن کە بەرانبەر بە پارە، پیاهەڵدان و ستایش یان ناوبانگ بێباك بیت.**

**(تۆماس ژۆلف)**



**ئەگەر هەموو ئاڵتونەکانی دنیایان بتواندایەتەوە و بیانکردایەتە قاڵب، قەبارەکەی ئەوەندەی خانوویەکی هەشت ژووری دەبوو. ئەگەر ئەو ئاڵتونانە ببووانایەتە موڵکی کەسێك کە ملیاردها ملیارد دۆلاری هەبووایە، نەیدەتووانی بەهۆیانەوە هاوڕێ، کەسایەتین ئارامیی بیر و ویژدانی ئاسودە یان نەمری بکڕێت.**

**(چارلز باتینگ)**

ئازادبوون له بەندی چاوچنۆکی و چلێسی، سامانە:

**مرۆڤ دوای ئەوەی کە دەوڵەمەند دەبێت، ئاواتی دواتری ئەوەیە کە دەوڵەمەنتر ببێت.**

**(پەندی ئەمریکی)**

خۆپێگەیاندن و گەشە، سامانە:

**سامان واتە ئەوەی کە بتوانین ژیان بە تەواوی و نموونەییەوە ئەزموون بکەین.**

**(مارلین دیتریش)**

بەخشندەیی سامانە:

**ئەوەی کە بەدەستی دێنین دەوڵەمەندمان ناکات، بەڵکو ئەوەی کە دەیبەخشین بەتوانامان دەکات.**

**(هێنری وارد بیچەر)**

ئەگەر دەوڵەمەندبوون ببێـە هۆی لەدەستچوونی ئارامیمان، چیتر دەوڵەمەند نین. ئارامی دەوڵەمەندییە:

**تاکە کارێك کە سامان بۆ هەندێ لە مرۆڤـەکانی دەکـات، ئەوەیـە کـە نیگـەرانی لەدەستدانیان دەکات.**

**(ئەنتۆنی ریوارۆل)**

خۆناسین سامانە:

**هەموو ئەو سەیر و سەمەرەیەی کە ئاواتی بینینیت هەن، لە ناختدا شاراوەتەوە.**

**(سێر تۆماس بەروان)**

مەعریفەت سامانە:

**شتێکم نەبینی کە خوداوەندی تیا نەبینم.**

**(ئەبوعوسمان حیری)**

ئەدەب سامانە:

**ئەدەبی پیاو وەکو دەوڵەتی ئەو وایە.**

هەبوونی دڵێکی سوپاسگوزار سامانە:

**باشترین رێگە بۆ پاشا بوون ئەوەیە کە نیعمەتەکانتان بژمێرن نەك پارەکانتان.**

**(کالین مەکنزی)**

قسەی دواییینیش ئەوەیە کە کامەرانی و سامانی راستەقینە بریتییە لە توانای ئەفراندنی هێز، عەشق، شادی و هەستی خۆشبەختی لە ژیاندا. کاتێکیش بەمە دەگەین کە بتووانین بە تێگەیشتن لە مانای ژیان، لەسەر ئەو بنەمایە رۆژگار بەسەر ببەین. لەم بەشەدا ئاماژە بە مۆدێلە ئەقڵییەکانی ئەو کەسانە دەکەین کە بڕوابەخۆبوونیان هەیە. لەم بەشەدا چەمکەکانی وەکو پارە، کامەرانی و شکست و سەرکەوتن باس دەکەین.

کەسێك لێی پرسیم: چ تەگەرەیەك لەسەر ڕێگای
شادمانی و چالاکی بوونی هەیە.لە وەڵامدا وتم:
هەموو تەگەرەکان بریتین لە بڕوابوونی تۆ بە
هەبوونی تەگەرە. تەگەرەکان لە ئەقڵی تۆدان.

(وین دایەر)

## بیروباوەڕی پۆزەتیف و کاریگەر، سامانە.

...مەلا لەگەڵ کوڕەکەیدا بە ڕێگادا دەڕۆیشت کە لەپڕ بۆی دەرکەوت تەرمێك بەرەو گۆڕستان دەبەن. کوڕی مەلا پرسیاری کرد: (ئەو سنوقە دارینە چی تیایە؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (مرۆڤ)

کوڕەکە وتی: (بۆ کوێی دەبەن؟)

مەلا کە دەرفەتێکی بۆ ئامۆژگاری بۆ رەخسابوو، وتی: (شوێنێك کە نە خواردن و نە خواردنەوە، نە پۆشاك هەبێت و نە دار و نە ئاگر). کوڕەکەی وتی: (باوکە کەواتە دەیبەن بۆ ماڵی ئێمە!)

**سەرنج:** بیری دروست، سامانە، چونکە ژیان و چۆنایەتییەکەی بە تەواوی لەسەر بنەمای جۆری بیر و باوەڕەکانی مرۆڤ پێکدێت. هەژاری و سامان پێش ئەوەی پەیوەندییان بە هەلومەرجی دەرەکییەوە هەبێت، دەرەنجای بیروباوەڕی هەژارانە یان دەوڵەمەندانەیە.

هەندێك کەس پێیان وایە کە دروستکردنی ژیانێکی دڵخواز بەهۆی هەبوونی فاکتەری دەرەکیی کۆنترۆڵنەکراوی سەخت و هەندێ جار مەحاڵە.

ئەم کەسانە وێڕای هەژمارکردن و پیشاندانی هەلومەرجی دەرەکی وەکو واقعێکی بابەتی و بەرجەستە، لایەنگیرانی هێز بەوە تۆمەتبار دەکەن کە واقیعبین نین، بەڵام

لایەنگیرانی بیرخوازی لە وەڵامدا ئەوەیان بیر دەهێننەوە کە هەلومەرجی دەرەکی وەکو راستییەك بوونی هەیە. بەڵام ئاستی کاریگەربوونیان بەندە بە جۆری بیر و کرداری خودی تاکەکەس.

بۆ نموونە ئەوان ناوی ئەو کەسان دێنن کە لە هەلومەرجی سەختدا زاڵ دەبن، بەڵام کەسانێکیش هەن کە لە هەمان هەلومەرجدا رێگە بە تەگەرە و هەلومەرج نادەن کە بڕیاردەری کۆتایی بن.

**ئەگەر بەرگری لەو سنووربەندییانە بکەیت کە پێت وایە هەتن، دڵنیا بە دەبن بە راست. (ریچارد باخ)**

جارێکیان لە دیپاك چۆپرایان پرسی: (ئایا ئێمە ئیرادەی ئازادمان هەیە؟ یان چارەنووسمان لە پێشدا دیاریکراوە؟) لە وەڵامدا وتی: (هەردووکیان پەیوەندییان بە ئاستی ئاگایی تۆوە هەیە).

هەموو شتێك پەیوەندی هەیە بە ئاستی باوەڕ و ئاگاییمان. ئەگەر خۆمان لاوازتر لە هەلومەرجی دەرەکی ببینین، ژیان بە کۆنترۆڵنەکراو وێنا دەکەین و لەکاتێکدا کە خۆمان بە گەورەتر لە ژیان لەقەڵەم بدەین ئەوا بەسەریدا زاڵ دەبین.

لەم بەشەدا ئاماژە بەو مۆدێلە ئەقڵی و فیکرییانە دەکەین کە کەسانی سەرکەوتوو بەهۆیانەوە توانیوویانە لە ژیاندا بگەنە پێگەی گونجاو و سەرکەوتنی بەرچاو.

**ئەگەر دەتەوێ بەسەر چارەنووسدا زاڵ بیت، سەرەتا دەبێ بەسەر بیرکردنەوەتدا زاڵ بیت.**

دایکم بەیانییەك دەیگوت وەرزێکی دڵگیرە،من پێم
وت ژیان سێوێکە کە دەبێت بە توێکڵەوە قەپی لێ
بگریت.

(سوهراب سپەری)

## گۆڕینی خۆمان لە گۆڕینی دەوروبەر گرنگترە

...ڕۆژێکیان مەلا نەسرەدین لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێیانیدا کە هاتبووە دیدەنی، لەبارەی دراوسێیەکییەوە خەریکی دەردەدڵ بوو و سکاڵای لێدەکرد: (دەبێ ببینیت کە چەنێك منداڵەکانی و ماڵەکەی پیسن. مایەی نەنگییە مرۆڤ هاوسێیەکی وەهای هەبێت. سەیرێکی ئەو جلانە بکە کە بە تەنافەکەوەن، پەڵەی ڕەش بە لێفە و خاولییەکانەوە دەبینیت؟)

هاوڕێی مەلا بەرەو لای پەنجەرەکە چوو و وتی: (ئەزیزم! من پێم وایە جلەکانی ئەوان بە تەواوی پاکن، ئەوە پەنجەرەکەی تۆیە کە پیسە).

**سەرنج:** ئەگەر شوشەی پەنجەرەی ماڵەکەمان پاك بکەینەوە، جلەکانی هاوسێ پاکتر دێنە بەرچاو.

بیروباوەڕەکان وەکو چاویلکەیەك وەهان کە لە چاوانی خۆمان کردوون. ئێمە لە پشت پەنجەرە و دەرچەی بیروباوەڕمانەوە دەڕوانینە دنیا. بۆیە ئەوەی کە دەیبینین ئەنجام و ڕەنگدانەوەی بیرێکە کە بۆ خۆمان هەڵمانبژاردووە.

درێوی و پیسی لە دنیای دەرەوەدا نییە بەڵکو دەرەنجامی حوکمدانەکان و بیروباوەڕەکانە.

## بۆئەوەی ئاوێنەکە پاك بکەیتەوە،
## دەم و چاوت پاك بکەرەوە

ئەگەر ئاوێنە بە پیس ببینین لەبەرئەوەیە کە روخسارمان پاك نییە و پاك نەبوونەکەی لە ئاوێنەکەدا وێنەدەداتەوە. دنیا نەك بەو شێوەیەی کە هەیە بەڵکو بەو شێوەیەی ئێمە هەین دەبینین. مرۆڤەکان نەك بەو شێوەیەی کە هەن بەڵکو بەو شێوەیەی کە خۆمان هەین دەبینین. ئەو باشی و خراپییەی کە دەیدەینە پاڵ رووداوەکانی ژیانمان، دەرەنجامی بیر و حوکمە کەسییەکانمانن. ئەگەر رەشبین نەبین، رەش نابینین. زۆرجار لەبری گۆڕینی خۆمان، پیشە و هاورێکانمان دەگۆڕین.

دکتۆر حەبی ئارامبەخشی بۆ ژنێکی گەنج نووسی کە نیشانەی سترێس و گووشاری دەروونی پێوە دیار بوو داوای لێکرد دوو هەفتەی دوای کاریگەریی دەرمانەکان سەری لێبداتەوە.

دوای دوو هەفتە کە ژنەکە گەڕایەوە، دکتۆر پرسی:

–کەمێك گۆڕان لە خۆتدا هەست پێدەکەیت؟

–نە هەست پێناکەم، بەڵام وایدەبینم کە خەڵکی بە بەراورد بە پێشوو کەمێك ئارامتر دیارن!

–بۆچی ئەم ژنە گەنجە پێی وابوو ئەوانیتر ئارامتر بوونەتەوە؟ لە راستیدا لە دەوروبەریدا هیچ نەگۆڕابوو، جگە لە خۆی. ئەگەر ئێمە باشتر ببین، دنیا باشتر دەبێت. ئەگەر ئێمە دڵخۆشتر ببین، دنیا بە شوێنێکی شادیبەخشتر بۆ ژیان بەدی دەکەین. هەموو گۆڕانکارییەکان لە گۆڕانی بیرۆکەکان (چاویلکە)ی ئێمە دەست پێدەکات. تا ئێمە نەگۆڕێین، شتێك ناگۆڕێت، چونکە

## دنیا هەر ئەوەیە کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە.

هەموو وەرچەرخانەکان لە ئێمەوە دەست پێدەکەن. ڕەسەنترین و پایەدارترین گۆڕانکارییەکان، وەرچەرخانن لە بیرکردنەوە و باوەڕی ئێمەدا. ئەمەش، واتە ئازادی؛ هێز، هێز و ئازادیی هەڵبژاردن و زاڵبوون بەسەر چارەنووس و ژیانماندا.



**بەهەشت تەنیا چاویلکەیەکی تازەیە کە لە چاوی دەکەین.**

**(میجی ستیوارت)**

نەگەیشتن بە ئامانج کارەسات نییە،
کارەسات نەبوونی ئامانجە.
(بنیامین مینەر)

## هەبوونی ئامانج و پلان سامانە

...مەلا عادەتی ئەوەی نەبوو کە لەبەردەم کۆمەڵە خەڵکێکدا قسە بکات. لە شوێنێکدا داوایان لێیکرد بۆ خەڵك وتار بدات. ئەو بە مندە مندێکەوە وتی:

(هاورێیان ئەمشەو کاتێك من هاتمە ئێرە تەنیا خودا و خۆم دەمانزانی کە من لە بارەی چ شتێکەوە دەمەوێ قسە بکەم، بەڵام ئێستا تەنیا خودا دەزانێت من دەمەوێ چی دەڵێم).

سەرنج: جیاوازیی نێوان شکست و سەرکەوتن، جیاوازی ئامانج و سەرگەردانییە. خەون و ئاواتەکانمان چەندەی گەورە و شکۆمەندانەش بن، دەبێ بەشێوەی پلان و چوارچێوەی رێکخراو، پێناسە بکرێن و بنووسرێن تا لە رێگەی بەرنامەرێژیی گونجاوەوە بەدیهاتنیان لە ژیانماندا ببینین.



**نووسینی شتێك کە دەتەوێ رووبدات، یەکەمین هەنگاوە بۆ بەدیهێنانی.**

**(لوییس هارت)**

## ئامانج چییە؟

...دەگێرنەوە کە رۆژێکیان مەلا بە رێگەیەکدا دەڕۆیشت. سەیریکرد پیاوێك لە کەناری جۆگەیەك لەسەر ئەژنۆ کەوتووە سەرقاڵی ئاو خواردنەوەیە.

مەلا وتی: (ئەی كابرا بەمشێوەیە ئاو مەخۆرەوە!)

پیاوەكە سەری بەرز كردەوە و وتی: (بۆچی؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (چونكە ئەقڵت كەم دەبێتەوە!)

پیاوەكە پرسی: (ئەقڵ چییە؟)

مەلا وتی: (هیچ، لەگەڵ تۆم نەبوو، بخۆرەوە).

لەكاتێكدا كە كەسە بڕوابەخۆبووەكان لە ئیرادەیەكی پایەدارەوە سەرقاڵی ئامانج دانان و هەنگاونانن بەرەو فراوانكردنی ژیانی خۆیان، كەسە ناسەركەوتوو و بێ ئاگاكان، لە كۆڵانی ژیانی خۆیاندا گرمۆڵە بوون.

## ئاقڵ غافڵ نابێت، غافڵ ئاقڵ نابێت

**(پەندی فارسی)**

ئەگەر لەبارەی ئامانجەكان، ستراتیژەكان و پلانە درێژخایەنەكانیان لێیان بپرسیت، دەڵێن:

## (ئامانج چییە؟)

ئەوان وەكو مەلا تەنانەت خۆشیان نازانن بڕیار وایە كە ڕۆژانی دواتر كام كارانە ئەنجام بدەن و ژیانیان بە چ شێوەیەك دەبێ. تەنیا خودا دەزانێت كە چارەنووسیان بە كوێ دەگات.

**دنیا وەكو عادەتی وایە، ڕێگە بە رووی ئەو كەسانەدا دەكاتەوە كە قسە و كرداریان پیشانی دەدات دەزانن دەیانەوێ بۆ كوێ بڕۆن.**

**(ناپلیۆن هیل)**

دووبـارە ئەنـدازەگیری بکـە، چـونکە یـەك
جار دەتووانیت بیبڕیت.

## پلان دانان

...بـە مـەلایان وت: (جـەنابی حـەکیم بـەگ، ژنەکـەت خـۆی لـە سـەربانی ماڵـەوە هەڵدایە خوارەوە و مرد....)

ئەو دەستیکرد بە راکردن. لەپڕ وەستا و وتی: (ئـای لـەوە، خـۆ مـن مـاڵم نییـە). دووبارە دەستیکردەوە بە راکردن و پـاش کـەمێك وەسـتا و دووبـارە لەبـەر خۆیـەوە وتی: (خۆ من هەر بە راستی ژنم نییە). دیسان لە راکردن بەردەوام بوو و پاش چـەند ساتێك لەبەر خۆیەوە وتی: (ئای لەوە، خۆ من حەکیم نیم!)

**سەرنج:** ئەم شێوە رووبەڕووبوونەوەیە، مۆدێلی کرداریی دۆڕاوێکە. دەکەوێتـە رێ و دوایی بیر دەکاتەوە کە بۆچی دەستیکردووە بە رۆیشتن، لەگەڵ کێدا یـاوەر بـووە، ویستوویەتی بۆ کوێ بچێت، ئەبووایە چ ئامادەکارییەك بکرێت...

**بە ئامادەکاری نەکردن، ئامادەکاریی شکست دەکەین.**
**(بنیامین فرانکلین)**

پێویستە ئامانجەکان بگۆڕێن بۆ قۆناغ، پلان و پرۆژەی ئەقڵ تاوەکو کرداری بن و جێبەجێ بکرێن. بیرنەکردنەوە، سەرگەردانی و جەختکردنەوەی تـەنیا لەسـەر کـردار بەبێ تێڕامان، کەس ناگەیەنێتە ئەنجامی دڵخواز. پیاوێـك سـواری تاکسـی دەبێـت و داوا لە شۆفێر دەکات خێرا بڕوات. تاکسییەکە خێرا لێدەخورێت و پاش کاتێکی کـەم

شۆفێرەکە دەپرسێت: (دەبێ بۆ کوێ بڕۆم؟) موسافیرەکە لە وەڵامدا دەڵێت: (مەسەلەکە ئەوە نییە، تەنیا ئەوەیە کە دەبێ خێرا بڕۆم).

**کاتێك جیاوازیی نێوان جوڵە و ئامانج بزانیت، بەشی هەرە گەورەی تەگەرەکانی سەر ڕێگای سەرکەوتنت لابردووە.**

بە ڕاستی بۆچی بۆ هەندێ کەس مەسەلەکە ئەوە نییە کە دەیانەوێ چ کارێك بکەن، مەسەلەکەی ئەوان تەنیا ئەوەیە کە تەنیا کارێك بکەن و بەس. (زەریفی) دەڵێت: دۆڕاوەکان دوو گروپن. ئەوانەی کە بیر دەکەنەوە، بەڵام هەرگیز کرداریان نییە و ئەوانەش کە کرداریان هەیە بەڵام هەرگیز بیر ناکەنەوە.

بیرکردنەوە پلان دانان، واتە تێڕامان و ئەنجامی ئەو پرسیارانەی کە وەڵامدانەوەیان بەشی گرنگی پلانەکانمان پێکدەهێنن. پرسیاری وەکو: دەمەوێ بۆ کوێ بچم؟ بۆچی دەمەوێ بچم؟ دەبێ چ کاتێك بچم؟ چۆن چۆنی و لەگەڵ چ کەسانێك؟و...

نووسەرێك جێگە و گرنگی ئەم جۆرە پرسیارانە بەمشێوەیە شرۆڤە دەکات: من شەش خزمەتگوزاری ئەمینم هەبوون و هەرچییەك دەمویست لێیانەوە فێر بووم. ناوەکانیان بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: چەندە؟ چۆن چۆنی؟ چ کاتێك؟ تا چ ڕادەیەك؟...و لەگەڵ کێدا؟

**وام پێ باشترە لەگەڵ پێنج کەسدا کار بکەم کە بڕوایان هەیە بەوەی کە دەیکەن نەك پەنجا کەس کە ئەرکەکەیان روون نییە و بەهیچ شێوەیەك نازانن چی بکەن.**

**(پاتریك دیکنسن)**

بێچارەترین مرۆڤ لە دنیادا کەسێکە کە
روانگەی نموونەیی نییە.

(هێلن کێلەر)

## جیهانبینی

...مەلا نەسرەدین لە رێگای سەفەرێکی بازرگانیدا بۆ عەرەبستان لە یاوەرانی دوور کەوتەوە و بۆ چەند رۆژێك لە بیابانەکانی ئەوێ سەرگەردان بوو. بەردەوام بۆ ئێرە و ئەوێ دەڕۆیشت تا ئەوەی کە رۆژێکیان لەکاتێکدا کە لە بێ ئاوی و تینووایەتیدا لاواز ببوو، لە دوورەوە خێمەیەکی بینی کە عەرەبێکی بیابانگەڕ لە دەرەوەیدا وەستابوو.

بەرەو لای کابرای خێمەنشین رۆیشت و وتی: (تکایە کەمێك ئاوم بەرێ).

پیاوەکە لە وەلامدا وتی: (ببوورە بەڕێز، من ئاوم نییە، بەلام حەز دەکەیت پارچەیەك ئاوریشمم لێ بکڕیت؟)

مەلا بە توڕەییەوە هاواری کرد: (من خەریکە لە تینووا ئەخنکێم، من پێویستم بە ئاوە نەك ئەو شتە گاڵتەجاڕییەی کە تۆ ئەیڵێیت...)

عەرەبە بیابان نشینەکەلە وەلامدا وتی: (لە سەرەوەی ئەو تەپۆلکە لمینە نشینگەیەك هەیە  کە دەتوانی لەوێ ئاو بەدەست بێنیت).

مەلا بە هەردوو دەست و هەردوو پێکانی دەستیکرد بە پیاهەڵگەڕان بە تەپۆلکەکەدا. لە دوورەوە پیاوێکی بینی کە لە بەرانبەر خێمەیەك وەستابوو کە لەسەرەوەی نوسرابوو: نشینگەی بیابانی.

کابرای خێمە نشین کە جلێکی رێك و پێکی لەبەردا بوو پرسی:

(بەڕێز ئەتوانم یارمەتیت بدەم؟)

مەلا وتی: (ئەریٚ تۆ لێرە ئاوت لایە؟)

کابرای خێمە نشین لە وەڵامدا وتی: (بەڵیٚ بێگومان، بەڵام ئێمە لێرە پێشوازی لە خەڵکانێك ناکەین کە ئاوریشمیان پیٚ نەبێت).

سەرنج: ژیان وەکو پارچەکانی مەتەڵێك وایە. لەوانەیە لە قۆناغی یەکەمدا پەیوەندییەکی لۆژیکی لەنێوانیاندا بەدی نەکرێت، بەڵام کاتێك دانانیان تەواو دەبیٚ، بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو پارچە ناپەیوەندیدارەکان لەگەڵ یەکتریدا نەخشە و وێنەیەکی گەورە دەهێننە کایەوە.

گرنگترین خاڵ لە دروستکردنی مەتەڵێکدا هەبوونی پرۆژەیەکی هەمەکییە لە شتێك کە دەمانەویٚ پێی بگەین.

ئەو کەسانەی کەپرۆژەیەکی گشتی و کۆگیریان لە ئامانجەکان، پلانەکان و ژیانی خۆیان هەیە دەتووانن کەڵك لە هەر رووداو و هەلومەرجێکی بە رواڵەت ناپەیوەندیدار و سوودلێوەرنەگیراو وەربگرن وەکو ئامرازێك و پارچەیەك بۆ حەلکردنی مەتەڵی ژیانی خۆیان.

ئەو کەسانەی کە پلانیان نییە، بەندی رێژە روانینن. ئەوان هەمیشە سەرگەردانن و ناتووانن پەیوەندییەکی لۆژیکی لەنێوان رووداوەکانی ژیانی خۆیاندا بەرقەرار بکەن...

پارچەی ئاوریشمی زۆر لە ژیانی ئەم جۆرە کەسانەدا هەیە. بەڵام کاتێك رووبەڕوویان دەبنەوە دەڵێن: پارچەی ئاوریشم کوا بە کەڵکی من دێت؟ ئەسڵەن کیٚ پارچەی ئاوریشمی دەوێت؟ بۆچی ژیان بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە لەگەڵ مندا دەجولێتەوە؟...

من شتێکی ترم دەوێت و ژیان پارچەی ئاوریشمم دەداتیٚ!

ئەو پەیامە گرنگەی کە ئەم چیرۆکە بۆ هەمووانی هەیە، ئەمەیە: بە ئاسودەیی و بێباکانە بە لای هەلومەرج، ئیمکانات و دەرفەتەکانی ژیاندا تێنەپەڕین، هەرچەندە لە تێڕوانینی یەکەمدا بێ مانا و بێ سوود دیارن. روانین و بینایی خۆمان بخەینە کار و وەکو ئامرازێك بۆ خولقاندنی ئەو ژیانەی دەمانەوێ کەڵکی لێوەربگرین.

## هەر شتێك کە پوچ دیار بێت، رۆژێك بەکەڵك دیار دەبێت

رۆژێکیان پیاوێکی دێهاتی لەگەڵ کوڕەکەیدا دەیانویست لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر بچن. باوك سفرەی نانەکەی هەڵگرت و وتی: (ئاو لە بیاباندا نادۆزرێتەوە). کاتێك لە کوڵانی باخەکان تێپەڕین، لە قەراغی رێگا ناڵێکی ئاسنیان بینی. باوك وتی: (ئەمە دەست بدەیە بەکەڵك دێت).

> **ئەو شتانەی کە لە دیدی ئێمەدا سواو یان بێ سوودن، دەبنە شتی گەورە. (فیشەر)**

کوڕەکە لە وڵامدا وتی: (ئەرێ، پارچە ئاسنێکی شکاو بەکەڵك نایەت و پێوست بەو زەحمەتە ناکات). باوکەکە بۆی دەرکەوت کوڕەکە هێشتا ژیانی نەناسیووە و هەموو شتێکی کەم بەها لە روانینیدا بێ سوودە. ئیتر قسەی نەکرد و خۆی چەمایەوە و ناڵەکەی دەستدایە. لە دوایین ئاوەدانیدا گەیشتنە دوکانێکی ناڵبەندی. باوکەکە ناڵەکەی بەو ناڵبەندە فرۆشت و دوو سکەی وەرگرت.

هەروا بەردەوامبوون لە رۆیشتن. گەیشتنە دەستگێڕێك کە سینییەك گێلاسی لەسەر سەری بوو بۆ فرۆشتن. باوك بە دوو سکەکە بڕێك گێلاسی کڕی و خستییە ناو پەڕە کاغەزێکەوە و دووبارە لە رێگای بیاباندا بەردەوام بوون.

رۆژێکی گەرم بوو و لەو دەوروبەرە ئاو نەبوو و کوڕەکە تینووی بوو و تاقەتی ڕۆیشتنی نەمابوو. باوک لە پێشەوە بوو و کوڕە بەدوایدا دەهات. کوڕەکە وتی: (باوکە لێرانە ئاوی لێ نییە؟ دەمم وشك بووەتەوە). باوك لە وەڵامدا وتی: (بۆ نا، ئێستا پێی ئەگەین). کاتێك باوکەکە زانی کوڕ تینوویەتی، دەنکە گێلاسێکی هەڵدایە سەر زەوی. کوڕەکە خۆی گەیاندە گێلاسەکە و هەڵیگرتەوە و خستیە دەمییەوە. دەمی کە لە تینوویێتیدا وشك ببووەوە، تەڕ و تازە بووەوە.

دوای سەد هەنگاوێکی تر، باوکەکە دەنکە گێلاسێکی تری هەڵدایە سەر زەوی و کوڕەکە لەسەرخۆ هەڵیگرتەوە و خواردی. هەروا باوکەکە سەد هەنگاو سەد هەنگاو گێلاسی هەڵدەدانە سەر زەوی و کوڕەکە هەڵیدەگرتنەوە تا ئەوەی کە گێلاسەکان تەواو بوون.

دواجار گەیشتنە کانییەك و لەژێر درەختێکدا دانیشتن. ئەو کاتە باوك وتی: (بیرتە کە وتم ناڵەکە دەست بدەیە و وتت ئەو زەحمەتە پێویست نییە؟)

کوڕەکە وتی: (بیرمە).

باوکەکە وتی: (بینیت کە من هەڵمگرتەوە و بە پارەکەی گێلاسم کڕی؟ من ئەم گێلاسانەم بۆ تۆ کڕی، بەڵام هەموویم بەیەکەوە نەدایتێ بیخۆیت. دەمویست پەند وەربگریت. گێلاسەکان سی و حەوت دەنك بوون. تۆ جارێکیش ئەو زحمەتەت نەدایە بەر خۆت کە ئەو ناڵە لە سەر زەوی هەڵگریتەوە، بەڵام سی و حەوت جار چەمایتەوە دەنکە گێلاسەکانت هەڵگرتەوە و خواردت. بینیت ئەو ناڵە شکاوەی کە لە دیدی تۆدا بچوك و بێ بەها بوو، چۆن بەکەڵکی شکاندنی تینووایەتییەکەت هات؟ کەوایە هەمیشە بیرت بێت کە (هەر شتێك کە پوچ دیار بێ، با هەبێ بەکەڵك دێت).

دەستپێکردن گرنگترین بەشی هەر کارێکە.
(ئەفلاتون)

## تامەزرۆیی گەورەترین دارایی دنیایە

...رۆژێکیان مەلا بە ژنەکەی وت: (عەلەف دان بە وڵاخ تا ئێستا عایدی من بوو، لێرە بەدوا دەبێ تۆ عەلەف بدەیتە ئەم ئاژەڵە). ژنەکە قبوڵی نەکرد تا شەڕی لێکەوتەوە. دواتر ئەوە مەرجیان کرد هەر کەسێك یەکەم جار قسە بکات، عەلەف دان بە وڵاخ لە ئەستۆی ئەو بێت.

چەند سەعاتێك تێپەڕی و هەردووکیان بێدەنگ بوون تا ئەوەی کە دواجار ژنەکە ئۆقرەی نەما و هەڵسا و چووە لای دراوسێکان و بابەتەکەی بۆ باسکردن و داوای لێکردن دەفرێك چێشت بۆ مەلا بنێرن. بە دراوسێکانی وت مەلا زۆر چەموش و لاسارە. ئەگەر لە برسانیشا بمرێت قسەیەك ناکات.

هاوسێکان دەفرێك چێشتیان دایە منالێك تا بۆ مەلای ببات. بە رێکەوت پاش رۆیشتنی ژنەکە، لەبەرئەوەی دەرگایماڵەوە بە کراوەیی جێ هێڵرابوو، دزێك چووە ناوەوە و هەموو شتە گرانبەهاکانی کۆ کردەوە و دواجار چووە ناو ژووری مەلا و سەیریکرد کەسێك لەوێ بێدەنگ دانیشتووە و ناجوڵێت. پێی وابوو داماوە ئیفلیجە.

بۆ تاقیکردنەوە چووە پێشەوە و مەندیلەکەی لەسەری لابرد، بەڵام مەلا هیچ بەرەنگاری نەکرد و قسەشی نەکرد. دزەکە بە کەلوپەلە دزراوەکان لە ماڵەکە چووە دەرەوە. لە هەمان کاتدا کوڕی دراوسێکە بە دەفرێك چێشتەوە چووە ژوورەوە و سەیریکرد مەلا وەکو پارچە بەردێك بێ جوڵە دانیشتووە.

دەفرەکەی لەبەردەمی لەسەر زەوی دانا و وتی: (ئەمەیان بۆ تۆ ناردووە). مەلا بە ئاماژەکردن منالەکەی وا تێگەیاند کە دز ماڵەکەی تاڵان کردووە و ئاماژەی بە

مەندیلەکەیدا و سێ جار دەستی بە سەر سەریدا سوڕاند و داوای لێکرد ژنەکەی ئاگادار بکاتەوە.

منداڵەکە وا تێگەیشت کە مەلا دەڵێت دەفرە چێشتەکە سێ جار بەسەر سەری مندا بسوڕێنەوە و بەسەرمدا بیڕێژە و ئەو بە قسەی مەلای کرد. پاشان گەڕایەوە و بابەتەکەی بۆ ژنەکەی باس کرد. ژنەکە کە تێگەیشت رووداوێکی گرنگ رویداوە، بەپەلە گەڕایەوە ماڵەوە و سەیریکرد ماڵەکە بەتاڵە. مەلاشی بینی کە وەکو تەختەی وشك دانیشتووە و سەر و بیچمی هەمووی چێشتە. هاواریکرد: (ئەوە کەی وەزعە؟) مەلا وتی: (دە برۆ عەلەف بدە بە وڵاخەکە).

سەرنج: ئەو مرۆڤانەی بڕوابەخۆبوونیان هەیە، ئەنگێزەکانیان بەرزە بۆ جوڵە و هەنگاونان. بەردەوام تامەزرۆییەکی زۆریان تیادا هەیە.

بەپێچەوانەشەوە، ئەو مرۆڤانەی کە بڕوابەخۆبوونیان نییە، هەمیشە چوارمشقی دانیشتوون. ئەوان بەینیان لەگەڵ هەوڵ و هەنگاونان نییە و هەموو رۆژێك بیانوویەك دەدۆزنەوە کە ئەو کارەی کە دەبێ ئەمرۆ ئەنجامی بدەن بخەنە سبەینێ.

لە راستیدا کەسانی تەنبەڵ دووچاری جۆرێك لە نەخۆشین کە من بە نەخۆشی (کەمی رەفتار بەرانبەر بە ئامانج) ناوم بردووە.



**بۆ بەرهەمهێنانی نیو کیلۆ هەنگوین، مێشەکان شیلەی نزیکەی دوو ملیۆن گوڵ هەڵدەمژن**

بیانوو هێنانەوە، تەنبەڵی، ئەمرۆ و سبەی کردن و بێ ئیرادەیی لە تایبەتمەندیەکانی مرۆڤە ناسەرکەوتووەکانە. بەڵام ئەو پرسیارە گرنگەی لێرەدا دەخرێتە روو ئەوەیە کە بۆچی هەندێ کەس بۆ دانی بڕیاری گرنگ هیچ ئەنگێزەیەك و هێزی ئیرادەیان نییە.

بۆ گەیشتن بە وەڵامەکە دەبێ ئاگاداری دوو پرەنسیپ و یاسای بنچینەیی ژیان بین.

**یاسای یەکەم:** پرەنسیپی حەز بۆ چێژ و راکردن لە زەحمەت.

یەکێك هێزە ئەنگێزەییەکان لە مرۆڤدا و کاریگەر لەسەر رەفتاری، حەزیەتی بۆ چێژ و راکردنە لە زەحمەت. وایدابنێ کە تۆ دەست لە تەنێکی داخ دەدەیت. دەستبەجێ لەدەرەوەی ویست و نائاگایانە دەستت دەکێشیتەوە. ئەمە یاسایەکە کە بەسەر کۆئەندامی دەماردا زاڵە. کۆئەندامی دەماری مرۆڤ بەشێوەیەکە کە لە ئازار دووری دەخاتەوە و بەرەو چێژ دەیبات.

**یاسای دووەم:** ئازارت نەبێ دەستکەوتت نابێ.

یەکێك لەو پرەنسیپانەی کە زاڵن بەسەر ژیاندا پرەنسیپی دانی باجەکەیە. مرۆز دەبێ هەوڵ بدات و هەنگاو بنێت، بەرگەی سەختییەکان بگرێت تا بگاتە ئەو ئەنجامەی کە دەیەوێت.

ئەم دوو یاسایەش ناکۆکن.

ئەو یاسایەی کە لە ناوەوەی مرۆڤدا هەیە، لە سەختی و ئازار دووری دەخاتەوە، بەڵام یاسای سەرکەوتن بەرەو ئازار (بۆ گەیشتن بە ئامانج) دەیبات.

ئەنجامەکەش ئەوە دەبێت کە مرۆڤ رووبەڕووی ناکۆك دەبێتەوە. لەم ناکۆکییەدا هەمیشە یاسای یەکەم لەسەر حەقە، چونکە پرەنسیپێکە کە لەناو ناخی مرۆڤدا هەیە و بەسەر کۆئەندامی دەماردا زاڵە.

ئەی چی بکرێت؟

**زۆرجار ئەو وزەیەی بۆ دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی خەرج دەکرێت، بەسە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە هەر لەو رۆژەدا**

# موعجیزەیەك بەناوی ئایندەبینی

مرۆڤە بەئەنگێزەکان ئەو کەسانەن کە توانیوویانە لە رێگەی ئایندەبینییەوە کێشەی ناکۆکبوونی نێوان دوو پرەنسیپ چارەسەر بکەن. ئەوان لەبری سەرنجدان لە زەحمەتەکانی کار، دەڕواننە گەنجینەکانی سەرەنجامی کارەکانیان.

دوو کات هەیە: کاتی ئێستا و ئایندە و هەریەکە لەم کاتانە دوو رووبەری زەحمەت و چێژیان تێدایە.

| ئێستا | ئایندە |
|---|---|
| زەحمەت | زەحمەت |
| چێژ | چێژ |

**زەحمەتی ئێستا:** هەوڵ و هەنگاونان لەبری زەحمەتکێشان بۆ گەیشتن بە ئامانج.

**چێژی هەنوکەیی:** رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ زەحمەتەکانی هەنگاونان و وێڵبوون بەدوای پشوو، سەرگەرمی و خۆشگوزەرانیدا.

**زەحمەتی ئایندە:** رۆژێکیان ئەوەی کە ئێمە پێمان دەگوت سبەی دەبێتە ئەمڕۆ و ئەگەر ئێمە هەوڵ و تەکانێکمان لە خۆمان نەخستبێتە گەڕ، ئەنجام و دەستکەوتمان نابێ. ئەوەشی کە ئەزموونی دەکەین، زەحمەتی شکست و زەحمەتی بێ بەرهەمی دەبێت.

**چێژی ئایندە:** خۆشی گەیشتن بە ئامانجەکان و تامەزرۆیی ئەزموونی کامەرانی.

ئایەندەبینی، واتە رۆیشتن بەرەو ئایندە و چەشتنی تامەکانی گەیشتن بە ئامانج و زەحمەتەکانی نەگەیشتن بە ژیانی دڵخواز. مرۆڤە بێ ئەنگێزەکان، تەنبەڵ و بێ ئیرادە، ئەو کەسانەن کە بیر لە ئەمڕۆی خۆیان دەکەنەوە و چاوی دووربینییان نییە.

چاوی دووربینیان نییە، چاوی دواوەبینیان هەیە، تەنیا دەڕواننە زەحمەت و چێژە هەنوکەییەکان.

**چاوی دووربین دەتوانێ ڕاست ببینێت**

**چاوی دواوەبین لوتبەرز و هەڵەیە**

**(مەولەوی)**

چیرۆکی ژیانی ئەم کەسانە، چیرۆکێکی تاڵە کە هاویندا نغرۆی خۆشگوزەرانی و سەرگەرمییە. بەو مێروولانە پێدەکەنن کە لە ئێستاوە پێشبینی دەکەن، بێ ئاگا لەوەی کە ئایندە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەبێتە ئێستا. ئەگەر ئەمڕۆ هەوڵ و کارێکمان ئەنجام نەدابێت، سبەی ئەنجام و بەرهەمێکمان نابێت، چونکە یاسای ژیان ئەمەیە:

**بۆ مرۆڤ شتێك نییە جگە لە هەوڵدان.**

**(قورئانی پیرۆز)**

**لەبری تەرکیزکردنە سەر زەحمەتی ئەنجامدانی کارەکان، تەرکیز بکەرە سەر بەرهەمی هەوڵەکەت.**

هیچ شتێك بێ سوودتر نییە لە ئەنجامدانی کارێکی
ناپێویست بە باشترین شێوە.

(پیتەر دراکەر)

## وەکو داراییەکانتان پارێزگاری لە کات بکەن

...ژنی مەلا لە تاو ئازاری دڵ ئاگای لە خۆی نەبوو. مەلا بڕیاریدا بەدوای حەکیمدا بڕوات. ئەو لە کۆڵانەکە بوو کە ژنەکە لە پەنجەرە سەری هێنایە دەرەوە و پێی وت: (ئازاری دڵم باشتر بووە و پێویست ناکات حەکیم ئاگادار بکەیتەوە).

مەلا گوێی لە قسەی ژنەکەی نەگرت، چووە لای دکتۆر و وتی: (ژنەکەم تووشی ئازارێکی توندی دڵ ببوو، بەڵام کاتێك خەریك بوو دەهاتمە لای تۆ وتی حاڵم باشتر بووە، ئێستا هاتوومە لای تۆ تا پێت بڵێم پێویست ناکات بێیت).

**سەرنج:** مەلا پێویستی نەدەکرد بڕوات و بە دکتۆر بڵێت پێویست ناکات بێیت. بەڵام ئەم کارەی کرد. ئەمە کتومت روانگەیەکە کە زۆر کەس لە ژیانی خۆیاندا گرتوویانەتەبەر. ئەوان بەو کارانەوە سەرقاڵن کە ئەنجامدانیان پێویست نییە.

**هەوڵی زۆر بدە، ژیان کورتە**

**کار بەچاکی بگرەبەر، دەرفەتەکە هەریەکە**

کات، واتە ژیان، واتە تەمەن، کاتێك قسە دێتە سەر بەڕێوەبردنی کات، مەبەست بەڕێوەبردنی ژیانە. گرنگترین مۆدێلی ناسراو لەبارەی بەڕێوەبردنی کات، ئەولەویەتبەندی (گرنگ، گرنگتر،...)ی ئەو چالاکی و کردارانەیە کە دەبێ ئەنجامیان بدەین. بەم پێیە دەبێ زۆرترین کاتی خۆمان بۆ ئەو کارانە تەرخان بکەین کە گرنگی زیاتریان هەیە.

گرنگترین کار ئەوەیە کە گرنگترین کار بکەینە گرنگترین کار.
(ستیڤن کۆڤی)

## یاساغ، مەکروە، واجب، بەجێ

**١–واجبەکان:** ئەو چالاکییانەی کە ئەنجامدانیان پێویستە، گرنگە. بەجۆرێك کە هەموو مرۆڤەکان پابەندن بە ڕەچاوکردنیان.

**٢–بەجێیەکان:** ئەو چالاکییانەی کە ئەنجامدانیان پێشنیار دەکرێت، بەڵام لە ئاستێکی کەم بایەختری واجبەکاندان.

**٣–مەکروهات:** ئەو کردارانەی کە ئەنجامدانیان پێشنیار ناکرێت و وا باشترە کە نەکرێن.

**٤–یاساغەکان:** ئەو کارانەی کە تاکەکان بە توندی ڕێگریان لێدەکرێت لە ئەنجامدانیان.

من پەیوەست بە بەڕێوەبردنی کات وەکو درامایەك کەڵك لەو مۆدێلەی ئەدەبیاتی دینی وەردەگرم. بەم شێوەیەیە کە هەر کەسێك دەتوانێت کار و کردارەکانی خۆی بە درێژایی ژیانی ڕۆژانە بۆ چوار بەش دابەش بکات. لێرەدا پێوەری دابەشکردن و ئەولەویەتبەندیی ئەو کارانە، ئامانجانە، پرەنسیپ و بەهایانە هەیە کە تاکەکەس بۆ خۆی هەڵیبژاردووە.

لە دۆخی نەبوونی ئامانجی تەواو ڕووندا، بەشێوەیەکی سەیر دەپرژێینە سەر کارە سواوەکانی ڕۆژانە.

ئامانج و ئایدیاڵەکانی هەر تاکەکەسێك روونی دەکاتەوە کە ئەو لە هەر سات و کاتێکدا ئەبێ کام کارانە بخاتە ناو ئەولەویەتبەندییەکانی خۆیەوە.

ئەو کارانەی کە لە ئاقار پلانە گەورەکان و فەلسەفەی ژیاندان، بەشێکن لە کردارە واجب و بەجێکان. هەر کردارێك کە کاریگەری هەبێت لە بەدیهێنانی ئامانجەکاندا، بە مەکروهـ و ئەو کارانەی کە لە ئامانجی ژیان دوورمان دەخەنەوە بە یاساغ لەقەڵەم دەدرێن، لەم روانگەیەوە دەتوانرێ ژیان بکرێتە چوار بەش:

| رووبەری بردنەوە | رووبەری دۆڕان |
|---|---|
| ١-واجبات | ٢-مەکروهات |
| ٢-بەجێیەکان | ٣-یاساغەکان |

مرۆڤە هۆشمەندەکان کەسانێکن کە هەمیشە لە رووبەرەکانی ١ و ٢دا ژیان بەسەر دەبەن، واتە ئەوان هەمیشە خەریکی ئەنجامدانی کارە گرنگ، بەکەڵك و کاریگەرەکانن و دۆڕاوەکانی ژیان کەسانێکن کە بەشێکی گەورەی تەمەنی خۆیان لە رووبەرەکانی ٣ و ٤دا بەسەر دەبەن. ئەوان خەریکی ئەنجامدانی کارە پڕوپوچ و هەڵەکانن کە نەك تەنیا سوود بە حاڵیان ناگەیەنێت، بەڵکو لەسەر رێگای گەیشتن بە مەنزڵ لایاندەدات.

*ترسم لەوەیە نەگەیت بە کەعبەی ئەعرابی*

*ئەو رێیەی کە تۆ دەرۆیت دەتباتە تورکستان*

**پێرستنی ئەو کارانەی کە نابێ ئەنجامیان بدەین، گرنگترە لە پێرستی ئەو کارانەی کە دەبێ ئەنجام بدرێن.**

ئەگەر کەسێك خەریکە ئەنجامێکی باشتر لە
تۆ بەدەست بێنێت، لەبەرئەوەیە لە شتێك
دەزانێ کە تۆ لێی نازانی.

## سوودوەرگرتن لە ئەزموونی ئەوانیتر سامانە

...حاکمی شار فەرمانیدا رایبگەیەنن کە هەرکەسێك دەزانێ خواردنێك لێ بنێت، شێوازەکەی بنووسێت و بینێرێتە (دارالحکومە). چونکە چێشتلێنەرێکی تایبەت دەیەوێ کتێبێکی چێشتلێنان ئامادە بکات.

هەر کەسێك هەر شتێکی دەزانی نووسی. نۆرەی مەلا هات. ئەو وتی: (من خواردنێکی تازەم داهێناوە. شیر و هەنگوین تێکەڵ بکەن و لێی بنێن).

حاکم داهێنانەکەی مەلای بیستەوە، ئەوی بانگهێشت کرد بۆ نانی بەیانی. برێك شیری تێکەڵ بە هەنگوینی لەبەردەم دانا. مەلا برێکی لێ خوارد، حاڵی تێکچوو و دەستی لە خواردن کێشایەوە، حاکم پرسی: (ئەی ئەم خواردنە خۆت داتنەهێناوە؟)

مەلا وتی: (دامهێنابوو، بەڵام تاقیم نەکردبووەوە).

**سەرنج:**

**خۆش بوو کە مەحەك، ئەزموون بێت**

**تا ئەوەی نیازی بێ غەش، رووی رەش بێت**

**(حافز)**

ئاندرێ جید بڕوای وایە: ئەزموون قوتابخانەیەکی زۆر باشە، بەڵام مانگانەکەی زۆرە. هەرچەندە لە بوارە مەعنەوییەکاندا لایەنی زۆر هەن کە دەبێ تاکەکەس خۆی ئەزموونی بکات و تەنیا بیستنی ئەزموونە بەسوودەکانی ئەوانیتر بەس نییە، بەڵام لە بواری دنیایی و مادیدا بنچینەکە مۆدێلسازی و سوودوەرگرتنە لە ئەزموونەکانی

ئەوانیتر. لە روانگەی جۆری روبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەزموونەکان لە دنیادا، کەسەکان بۆ سێ گروپ دابەش دەبن:

گروپی یەکەم سوود لە ئەزموونەکانی خۆیانەوە فێر دەبن، ئەمانە ژیرەکانن. گروپی دووەم لە ئەزموونەکانی ئەوانیترەوە فێر دەبن، ئەمانەش گروپی خۆشبەختەکان پێکدەهێنن و گروپی سێیەم نە لە ئەزموونی خۆیان و نە لە ئەزموونی ئەوانیتر فێر دەبن و ئەمانەش کەساسەکانن.

ئێمە لە هەر مرۆڤێکی بەدڵ کۆمەڵە کارێك فێر بووین

ناڵە لە نەی و گریان لە هەوری بەهار فێر بووین

گریمانەی گرنگی سوودوەرگرتن لە ئەزموونەکانی کەسە بەئەزموونەکان ئەمەیە:

**هیچ کام لە ئێمە ئەوەندەی هەموومان بەئەزموون نییە.**

ئەوەی کە دەیزانین و دەتووانین بیزانین و ئەزموونی بکەین، لەبەرانبەر ئەزموون و ژیریی گروپێکدا، دڵۆپەیەکە لەبەرانبەر ئۆقیانووسێکدا.

**( و ئێوە جگە لە بڕێکی کەم، زانستتان نییە)**

**(قورئانی پیرۆز)**

مرۆڤە وردەکار و بەتواناکان لەم یاسایە ئاگادارن. ئەوان هەمیشە بەشێوەیەکی خاکی و هۆشمەندانە ئامادەیی ئەوەیان هەیە لە پۆلی کەسە خاوەن ئەزموونەکاندا ئامادە بن و بخوێنن.

ئەوان دەزانن کە بڕوابەخۆبوون هەمیشە بە مانای تاکڕەوانە رەفتارکردن و لوتبەرزی و بانگەشەی هەبوونی ئەزموون نییە لە هەموو بوارێکدا. هەندێ جار بەرزترین توانا ئەوەیە کە مرۆڤ دان بە بێ توانایی و نەزانی خۆی دابنێت.

**بۆ ناسینی ڕێڕەوی بەرەوپێشچوون، پرسیار لەو کەسانە بکەن کە دەگەڕێنەوە.**

**(پەندی چینی)**

ئـــەزموون هەمیشە لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا
نییە، چونکە هیچ رووداوێك دووجار روونادات.
(چەرچڵ)

## سەرزەنشتکردنی لاسایی نائاگایانە

...مـەلا لـە یـەکێك لـە سـەفەرەکانیدا دەیویست لـە رووبارێـك بپەڕێتـەوە. ئـەو نەیدەزانی کە قووڵایی رووبار چەنێکە و نەشیدەزانی ئاخۆ وڵاخەکەی دەتـوانێ لێـی بپەڕێتەوە یان هەر لە سەرەتادا نقوم دەبێت.

بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و منداڵێکی کـوڕی لـەو نزیکیانە بینی. چارەی نـەبوو جگـە لـەوەی کـە داوای یارمـەتی لـەو بکـات. کوڕەکـە سەیرێکی وڵاخەکەی مەلای کرد و پاش هەڵوەستەیەك بە دڵنیاییەکی تـەواوەوە وتـی ئـەو دەتـوانێ بـە وڵاخەکـەی زۆر بـە ئاسـودەییەوە و بـە سـەلامەتی لـە رووبـار بپەڕێتەوە.

مەلا بە سواری وڵاخەکە چووە ناو رووبارەکەوە. کاتێك گەیشـتە ناوەڕاسـت، لـەپڕ بۆی دەرکەوت کە شـتێك نـەماوە نقـوم ببێـت. هەرچـۆنێك بێـت خـۆی رزگـار کـرد و پاشان بە هاوار هاوارەوە بەرەو منداڵەکە رۆیشت و هەڕەشـەی ئـەوەی لێکـرد کـە بـە سەختی سزای دەدات.

کوڕەکـە بـە هەسـتێکی چەوسـانەوە وتـی: (بـەڵام قوربـان، مـن سـەیر ئەکـەم مراوییەکانم هەموو رۆژێك بەبێ هـیچ کێشـەیەك لـەم بـەری رووبارەکـەوە بـۆ ئەوبـەر دەپەڕنەوە و خۆشت دەبینیت کە پێیەکانی مراوییەکانم لە پێیـەکانی وڵاخەکـەی تـۆ کورتترن!)

**سەرنج:** ئەو کاتەی کە پێویستت بە رێنماییە، داوای یارمەتی لە کەسێك بکە کە هەلومەرجی تۆ دەرك دەکات و دەزانێت کە لە چ بارودۆخێکدایت. پێش کارکردن بە تێڕوانینی ئەوانیتر، لەلای خۆتانەوە هەڵیسەنگێنن، چونکە سوودوەرگرتن لە ئەزموونی ئەوانیتر بە مانای پەیڕەوی و لاسایی کوێرانە نییە.

وەکو چەرچِل دەڵێت هیچ رووداوێك دووجار بە یەك شێوەی تەواو لەیەکچوو روونادات. دەبێت هەلومەرجی خۆت و ئەوانیتر بە تەواوی هەڵسەنگێنیت و ئاگاداری جیاوازی و لێکچوونەکان بیت.

**کەسێك بە مەلا نەسرەدینی وت: (چاوم ئازاری هەیە، عیلاجەکەی چییە؟ مەلا لە وەڵامدا وتی: (پێش ماوەیەك من دانم ئێشی هەبوو، کێشام).**

مـرۆڤ دەبـێ ئەوەنـدە گـەورە بێـت کـە هەڵـەکانی قبوڵ بکات، ئەوەندە هۆشمەند بێت کـە پەنـدیان لێوەرگرێت و ئەوەنـدە بـەهێز بێت کـە راسـتیان بکاتەوە.

## هەڵەکان بەشێکن لە پرۆسەی فێربوون

...یەکێك لە هاورێیانی مەلا بە پزیشکییەوە سـەرقاڵ بـوو. رۆژێکیـان پێکـەوە لـە گۆڕستانێك دەپەڕینەوە. پزیشك دەستەکانی خۆی لەسـەر روخسـاری دانـابوو. مـەلا پرسی: (لەبەر چ کەسێك رووی خۆت گرتووە؟)

پزیشك لە وەڵامدا وتی: (شـەرم لـە مردووەکـانی ئـەم گۆڕسـتانە دەکـەم، چونکە دەبینم زۆربەی ئەم بێچارانە بە پزیشکی و دەرمانەکانی مـن ماڵئاواییـان لـەم دنیایـە کردووە).

**سەرنج:** هەڵەکانی پزیشك ببووە هۆی مردنی کۆمەڵە خەڵکێك. کۆمـەڵێك هـەن لـە ژیاندا ئەوەندە لەهەڵە دەترسن وەك بڵێی هەڵەکردن وات مەرگ.

## سەرەتا عەشق ئاسان دیار بوو بەڵام کێشە پەیدا بوون

پاش پلان دانان و هێنانەکایەی ئەنگێزە و پەیمانی دەروونـی، لـە رێگـەدا هـەنگاو دەنـێین و سـەفەرەکەمان دەسـت پێدەکـەین. هێشـتا مەودایـەکمان نـەبڕیووە کـە رووبەڕووی کێشە و پرسی چاوەڕواننەکراو دەبینـەوە. هـەوڵ دەدەیـن چارەسـەریان بکەین و لەوانەیە سەرکەوتووش بین. جوڵەکە دووبارە دەست پێدەکاتەوە و جارێکی تر پرس و قەیرانی نوێ دێنە پێشەوە. لەم هەلومەرجەدا کەسانێك مل ئەدەن.

ئـەوان تـوڕەن و نائومێـدن لـە هـەبوونی تەگـەرەکان، نیعمـەتی خەونـەکانیان لـە ڕووبەڕووبوونەوەدا وێڵ دەکەن. ئەو کەسانەی کە مل نادەن، بە ئومێدەوە درێژە بـە سەفەر دەدەن، بەڵام وەك بڵێـی بڕیـار وا نییـە دەردەسـەری و هەڵـەکان وازیـان لـێ بێنن.

هەلومەرجەکە بە جۆرێك دەچێتە پـێش کـە هەنـدێکی تـریش دەسـتەکانی خۆیـان بەرز دەکەنەوە و نیشانەی ملدان پیشان دەدەن. کەسانێك دەمێننەوە کە مەشـخەڵی جدیـەت و بڕوابـەخۆبوون لـە خۆیانـدا بـە ڕوونـاکی دەهێڵنـەوە. ئەمانـە درێـژە بـە درێژەدان دەدەن!...بەڵام باش دەزانـن تـا کـاتی گەیشـتن بـە مەبەسـت، تەگـەرە و قەیرانی زۆر هەن کە دەبێ بەسەریاندا زاڵ بن. ئەم سروشتەش ڕێـڕەوی کامەرانییـە: دوو هەنگاو بەرەو پێشەوە هەنگاوێك بۆ دواوە.

ئەزموونی ساتە سەخت و نائومێدکەرەکان...بەرەنگاری و ئاشکرابوونی دووبـارەی هەلومەرجی ئومێدبەخش و دڵگەرمکەر.

پـاش سـاڵانێك توێژینـەوەی بەسـەرهاتی مرۆڤـە سـەرکەوتووەکان و هـەروەها ئەزموونە کەسییەکان، گەیشتوومەتە ئەو ئەنجامەی کە زۆربەی تاکەکان لەبەر ئـەوە لە ڕێگەی ژیانـدا ناگەنـە مەبەسـتە دڵخوازەکـانی خۆیـان چـونکە ئاشـنایەتی زۆریـان لەگەڵ ڕێگاکە و هەلومەرجەکەی نییە. هـەموو ڕێگاکـانی سـەرکەوتن حـەوت حاڵـەتی سـەخت و درێـژیان تێدایـە کـە دەبـێ بـبڕدرێن تـاوەکو تاکەکـەس بگاتـە ئامانجـە کۆتاییەکەی.

***کە عاشق بووم وتم بردوومە گەوهەری خوازراو***

***نەمدەزانی ئەم دەریایە شەپۆلی خوێنی زۆری هەیە***

**(حافز)**

ئەو حەوت حاڵەتە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

١-کات (ئارامگرتن)

٢-ئەزموون (بەدەستهێنانی زانین، زانیاری و شارەزایەتی)

٣-کێشەکان

٤-هەڵەکان

٥-شکستەکان

٦-تەنیایی و گۆشەگیری (رۆیشتن بە پێچەوانەی تەوژمی ئاو)

٧-هەلومەرجی پێشبینی نەکراو

هەر کەسێك کە دەیەوێ بگاتە ئامانجەکانی خۆی، دەبێ ئاگادار بێت لەوەی کە ئەزموونی دەیان قەیران، شکست، هەڵە، دەرکران و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ لافاوی رەخنەکاندا بەشێکن لەو واقعیەتانەی کە لەسەداسەد بەدرێژایی رێڕەوەکە رووبەڕوویان دەبێتەوە.

ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە خۆیانە بەباشی لەو هەلومەرجە بەئاگان، لەکاتێکدا کە مرۆڤە نائومێدەکان، بە تێنەگەیشتن لە هەلومەرج و بە ئەزموونی یەکەمین ناهەمواربییەکان، هەموو شتێکیان خستووەتە ملی نەگبەتی، بە نائومێد لە بەردەوامبوون لە رێگاکە پاشەکشە دەکەن.

**من هەرگیز سارد نابمەوە، چونکە بۆ من هەر هەوڵێکی نادروست کە دەستی لێدەکێشمەوە واتە هەنگاوێك بۆ پێشەوە.**

## حاڵەتی چوارەم: هەڵەکان

هەڵەکردن بەشێکی زۆر سروشتیی ڕێگەیەکە کە دەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان ببڕین. هیچ منداڵێك لە یەکەمین هەوڵدا، بەبێ هەڵە ناتوانێت قسە بکات. هیچ باڵندەیەك بەبێ هەڵە فێری فڕین نابێت. هیچ زانایەك بەبێ بەهەڵەداچوون ناتوانێت شتێك بدۆزێتەوە یان دابهێنێت. هیچ وەرزشکارێك بەبێ هەڵە شارەزا و لێهاتوو نابێت.

ئەو مرۆڤانەی کە بڕوابەخۆبوونیان هەیە باش دەزانن کە هەڵەکردن واتە فێربوون. ئەوان لە هەڵەکردن ناترسن. ڕێگە نادەن هەڵەکانیان دووچاری لاوازی و نائومێدییان بکات، چونکە بڕوایان وایە کە بەهۆی هەڵەوە تێڕوانینیان فراوان دەبێت و شارەزایەتیی پێویست بەدەست دێنن و شتی نوێ فێر دەبن.

**هەڵەکان پردێکن لەنێوان بێ ئەزموونی و ژیریدا.**

**(فیلیس تورو)**

## ترس لە هەڵەکردن گەورەترین هەڵەیە

-یەکێك لە نیگارکێشەکان لەگەڵ گۆڕینی پیشەکەیدا، کلینیکێکی کردەوە. یەکێك لێی پرسی: (لە پیشەی پزیشکیدا چ ئیمتیازێکت بینیووە کە دنیای هونەرت جێ هێشتووە؟)

وتی: (ئەم ئیمتیازەم بینیووە کە هەر هەڵەیەك ئەنجامی بدەم، خاك دەیانشارێتەوە).

—**ئەلێگزاندەر پۆپ:** (پیاو نابێ شەرم بکات لە هەڵەکانی رابردووی خۆی، چونکە ئەمە بەو مانایەیە کە ئەمڕۆکە بە ئەزموونتر و ئاقڵترە لە دوێنێی خۆی).

—**ئەلبێرت ئەنیشتاین:** (کەسێك کە هەرگیز هەڵەیەکی نەکردبێت، هەرگیز هیچ شتێکی نوێ تاقی ناکاتەوە).

—**دیزی بنتیس:** (کەسێك کە هەرگیز هەڵە ناکات، هەمیشە فەرمان لە کەسێکەوە وەردەگرێت کە هەڵە دەکات).

—هەڵە لە بارێکدا خراپە کە هیچ وانەیەکی لێوە فێر نەبیت.

## بیرکردنەوەی ئەفرێنەرانە سامانە

...رۆژێکیان کوڕی مەلا کەوتە ناو بیرەوە. مەلا هاتە سەر بیرەکە و هاواری کرد: (کوڕم، مەچۆ هیچ شوێنێك تا بڕۆم پەتێك بهێنم و هەڵتکێشمە دەرەوە).

سەرنج: کوڕی مەلا هیچ شوێنێکی نییە تا بۆی بچێت. لە ڕاستیدا ئەو هیچ ڕێگەچارەیەکی جگە لە ملدان نییە. بۆ زۆرێك لە کەسان، ژیان وەکو بیرێکی قووڵ وایە. ئەوان هەست دەکەن لە قووڵاییدا گیریان خواردووە و چارەیەکیان نیە بۆ هاتنە دەرەوە. ئەو شتەی کە زۆربەی کات ئەزموونی دەکەن، هەشتی دەستەوستانی، لاوازی، بێ توانایی و سنووردارییە.

***کە بەرتەنگی و بەرفرەیی هات تۆ مەبە نائومێد***

***قفڵچی هەم قفڵ دروست دەکات هەم کلیل***

**(مەولەوی)**

پێشتر وتمان کێشە و پرسەکان لەلایەکەوە تەگەرە و لەلایەکی ترەوە واقیعی ژیان دەهێننە کایەوە.

لە ژیانی هەموو کەسێکدا بیری کێشەگەلی زۆر هەن. مەسەلەکە ئەوەیە کە:

١-ئێمە چۆن ڕەفتار بکەین تا نەکەوینە ناو بیرەوە.

٢-لە حاڵەتی کەوتنە ناو بیر چۆن چۆنی ڕەفتار بکەین تا لێی بێینە دەرەوە؟

هاتنە دەرەوە لە بیری کێشەکان، پێویستی بە هەبوونی ئەم مۆێلە ئەقڵییەیە کە هەموو کێشەیەك ڕێگەچارەیەکی هەیە و تاکەکەس دەتووانێت لە ڕێگەی هێزی بیرکردنەوە و ئەفرێنەرایەتی خۆی ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆ هاتنە دەرەوە لە بنبەستەکانی ژیان بدۆزێتەوە.

**بیر لە مەترسییەکان مەکەوە، بیر لە ئەنجامەکان بکەرەوە. هیچ مەترسییەك ئەوەندە گەورە نییە کە رێگری ئەنجامدانی کارە پێویستەکان بێت. (چاك پیگەر)**

دکتۆرەکە پێی وابوو کاتی ئەوە هاتووە راستییەکە بە مەلا بڵێت، بۆیە پێی وت: (پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە راستی مەسەلەکەت پێ بڵێم. تۆ نەخۆشییەکەت سەختە و لەوانەیە لە دوو رۆژ زیاتر زیندوو نەمێنیتەوە. لەوانەیە بتەوێ خواستەکانت بڵێیت، کەسێك هەیە بتەوێ بیبینیت؟)

مەلا بە دەنگێکی کز وتی: (بەڵێ)

دکتۆر پرسی: (ئەو کێیە؟)

مەلا وتی: (دکتۆرێکی تر)

دکتۆرێکی تر، رێگەچارەیەکی تر، هەوڵێکی دووبارە، دەستپێکێکی تر... ئەمە دروشمی ئەو کەسە باوەڕبەخۆیانەیە کە توانیوویانە بە خۆلادان لە نائومێدی و ملنەدان نەوەستن و ئەوە بەدەست بێنن کە دەیانەوێ. تەنیا دەبێ باوەڕ بەوە بێنیت کە شتێك بەناوی مەسەلەی حەلنەکراو بوونی نییە.

بڕوابەخۆبوون: کێشەیەك نییە کە ئاسان نەکرێ. لاوازی: کێشە لە بن کێشە لە بن کێشەدایە.

## ئەفراندن واتە وەستانی لەناکاوی گەمژەیی

–کاتێك نوێگەرایی گەڵاڵە ئەکەیت دەبێ ئامادەی بیستنی هەموو قسەیەك و ئەوەش بیت کە خەڵکی بە شێت ناوت بێنن.

**(لالاری ئەلیسن)**

–گەورەترین دۆزینەوەکان هی ئەو مرۆڤانەن کە بە نیگایەکی جیاواز دەڕواننە بارودۆخێکی ئاسایی.

**(ئارا ئەروین)**

–من پێم باشە کڕیارێکم هەبێت کە بێتە ناو فرۆشگاوە و بڵێت: (ئای خوایە! تائێستا شتێکی وەهام نەدیووە!) نەك ئەوەی بڵێت: (ئای خوایە! سەیرکە چۆن گۆڕیوویانن و خستوویاننەتە ناو بازاڕەوە).

–ئەگەر من سێوێکم هەبێت و تۆش سێوێکت هەبێت و سێوەکانمان لەگەڵ یەکتریدا ئاڵوگۆڕ بکەین، ئەو کاتە هێشتا هەریەکەمان سێوێکمان هەیە. بەڵام ئەگەر هەر یەك لە ئێمە خاوەنی ئایدیایەك بین و لەگەڵ یەکتریدا ئاڵوگۆڕیان بکەین، ئەوا هەریەکەمان خاوەنی دوو ئایدیا دەبین.

**(جۆرج بێرنارد شۆ)**

–ژیان سەرانسەر تاقیکردنەوەی ئایدیاکانە، بۆئەوەی بزانین بە هیچ کوێیەك دەگەن یان نا.

**(رەی برادبێری)**

–کاتێك دەنگێکی نوێ لە جیهاندا دەنگ دەداتەوە، سەدان دەنگدانەوە بەر گوێ دەکەون. **(جۆن شەد)**

—هەر کە مرۆڤ تەڵەمشکێکی باشتر دابهێنێت، سروشت دەست بەجێ مشکێکی باشتری پێ دەبەخشێت.

(جەمیز کارزوِل)

—باشترین رابەرەکان ئەو کەسانەن کە نەریت شکاندن بەشێکی بنچینەییە لە کەسایەتییان. ئەوان نەیاریی نوێگەری ناکەن، بەڵکو خۆیان رەمزی نوێگەرین.

(دەیڤد ئوگلوی)

—خستنەڕووی پرسیار(ێکی گەمژانە) یەکەمین نیشانەی پێکهاتنی ئایدیایەکی تەواو نوێیە.

(ئالفرێد وایتهێد)

—لە راستیدا بەشداریی ئێمە بەشێوەیەکی رێکەوت بووەتەهۆی بەرهەمهێنانی بەرهەمی نوێ. بەڵام هەرگیز بیرتان نەچێت کە مرۆڤەکان تەنیا ئەو کاتە دەتووانن سەرکەوتوو بن کە بەردەوام لە جوڵەدا بن.

(ریچارد کارلستون)

—من ناتووانم لەوە تێبگەم کە بۆچی مرۆڤەکان ترسیان لە ئایدیای نوێ هەیە، لەکاتێکدا کە خۆم لە ئایدیا کۆنەکان دەترسم.

(جۆن کەیج)

—دەبێ پێکهاتنی ئایدیایەك لە ئەقڵدا وەکو دانیشتن لەسەر بزمارێك بێت، بەجۆرێك کە ببێتەهۆی ئەوەی لە شوێنی خۆت دەرپەڕیت و دەست بەکار بیت.

(ئەی.نێل سیمپسن)

**بیرۆکەیەکی باش بەدرێژایی رۆژ بە بێداری دەتهێڵێتەوە، بەڵام بیرۆکەیەکی نۆبەرە و باڵا، بە درێژایی شەو بە بێداری دەتهێڵێتەوە.**

**(ماریلین ڤاس سیڤنت)**

ئاڵتونی دەرهێنراو لە ئەقڵ باشترە لە ئاڵتونی دەرهێنراو لە کانەکان.

(ناپلیۆن هیل)

## شتێك نییە بە ناوی پرسیاری حەلنەکراو

رۆژێکیان مەلا لە کەناری رووبارێك دانیشتبوو و بە ئەسکوێ ماستی دەرشتە ناو ئاوەوە. رێبوارێك پێی وت: (مەلا ئەوە چی دەکەیت؟)

مەلا لە وەڵامدا وتی: (خەریکی دروستکردنی دۆم)

پیاوەکە لێی پرسی: (جا دەکرێ بە چەند ئەسکوێیەك ماست لەناو ئاوی رووباردا دۆ دروست بکەیت؟!) مەلا وتی: (نا، نابێت، بەڵام ئەگەر دروست بێ چ دۆیەك دروست دەبێ!)

**سەرنج**: جیاوازیی بڕوابەخۆبوون و لەدەستدانی، جیاوازی تەرکیزە لەسەر مومکینات و نامومکینات.

کەسانی ئەفرێنەر و بڕوابەخۆبوو بیر لە ئەگەرەکان و مومکینات دەکەنەوە. ئەوان کاتێك بیر لە ئەنجامە پۆزەتیڤەکان دەکەنەوە، (ئەگەر ببێ...) ئەنگێزەیەکی دووقات بۆ دۆزینەوەی رێگای گونجاو لەخۆیاندا هەست پێدەکەن. لە کاتێکدا کە کەسە ناسەرکەوتووەکان زیاتر تەرکیز دەکەنە سەر نامومکینات و مەحاڵەکان.



بەسەرهاتێکی منالیی کۆفی ئەنان

خۆ کۆفی ئەنانتان بیر نەچووەتەوە. ئەو سکرتێری پێشووی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و براوەی خەڵاتی نۆبڵە بۆ ئاشتی.

لێیان پرسی: (گرنگترین بیرەوەری تۆ لە قۆناغی خوێندن چییە؟) ئەو لە وەڵامدا وتی: (ڕۆژێکیان مامۆستای زانستمان هاتە پۆلەوە و کاغەزێکی سپی لکاند بە تەختە ڕەشەوە. پەڵەیەکی ڕەشی لە ناوەڕاستدا بوو. لە قوتابییەکانی پرسی: (منداڵەکان چی دەبینن؟)

هەموو لە وەڵامدا وتیان: (پەڵەیەکی ڕەش). مامۆستا بەشێوەیەکی بیرمەندانە بۆ چەند ساتێك چووە بەردەم تەختەڕەشەکە و پاشان بە دەستی خۆی ئاماژەی بە دەوروبەری پەڵە ڕەشەکە کرد و وتی: منداڵە ئازیزەکان، بۆچی ئەو هەموو سپیایەتیەی دەوروبەری پەڵە ڕەشەکەتان نەبینیووە؟)

کۆفی ئەنان دەڵێت: (لەو ڕۆژەوە هەموو هەوڵم ئەوە بوو کە یەکەم جار بڕوانمە سپێتی (باشییەکان، خاڵە ئیجابییەکان، ڕووناکییەکان و ...).

بیرکردنەوەی پۆزەتیڤ پێداویستییەکی ئەفرێنەرێتییە. واتە هەبوونی ئەقڵێکی کراوە بۆ دۆزینەوە و بینینی ئەو شتەی کە لەوانیتر دیار نییە.



**هەندێ کەس خاچ لەسەر گۆڕی خۆیان دادەنێن و هەندێك کەسیش دەیکەنە لەنگەری کەشتیی خۆیان.**

## ئەگەر ئەقڵ داخراو بێت چاو بێ کەڵکە

–لەنێوان بەربەست و دەرفەتدا چ جیاوازییەك هەیە؟

تێڕوانینمان بۆی.

هەموو دەرفەتێك سەختی لەگەڵدایە و هەر سەختییەك دەرفەتێکی لەخۆ گرتووە.

–كاتێك لەبارەی ئەو هۆكارەیان لە ئەلبێرت ئەنیشتاین پرسی كە زۆرترین ڕۆڵی هەبووە تا بتوانێت تیۆرەی ڕێژەگەرایی بدۆزێتەوە، لەوەڵامدا وتی: (تێگەیشتن لەوەی كە دەبێ چۆن چۆنی لەبارەی كێشەوە بیر بكەیتەوە.

**ئەقڵی مرۆڤ وەكو چەترە، تەنیا كاتێك بەكەڵك دێت كە كراوە بێت.**

–ئەفرێنەرێتی واتە ئەوەی كە بتوانیت شتێك ببینیت كە هیچ كەس نەیبینیووە و بتوانیت.بیر لە شتێك بكەیتەوە كە كەس بیری لێ نەكردووەتەوە، تا بتوانێت كارێك بكەیت كە هیچ كەسێك نەیكردووە.

–شكستخواردن لە ڕێڕەوی داهێناندا، باشترە لە سەركەوتن لە لاساییكردنەوەدا.

–ڕێگە مەدە كەس ببێتە ڕێگری ئەفرێنەرایەتی تۆ، چونكە وەكو ئەوە وایە ڕێگە بە كەسەكان بدەیت تەوژمی هەوا بەرەو تۆ بەربەست بكەن.

**ئەگەر هەلومەرج دەرگایەك دابخات، ڕێگەچارە سێسەد جار زیاتر دەیكاتەوە.**

## هەبوونی ئۆقرە سامانە

...رۆژێکیان مەلا نەسرەدین لە سوچێکی مزگەوت دانیشتبوو و لەژێر لێوییەوە خەریکی موناجات بوو کە لەناکاو پیاوێکی هەژار هاتە ژوورەوە. ئەو پێی وا نەبوو کەس لە مزگەوت بێت، سەری بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: (خودایە! هەزار ساڵ لە دیدی تۆدا چەنێکە؟)

مەلا کشایەوە پشت ستوونێك و بە دەنگێکی سەیر و نامۆوە وتی: (ئەی بەندەی من! هەزار ساڵ لە دیدی مندا چرکەیەکە).

کابرای هەژار کە دڵخۆش بوو بەوەی خودا وەڵامی داوەتەوە، وتی: (خودایە! دە هەزار دینار لە دیدی تۆدا چەنێکە؟)

مەلا وتی: ئەی بەندەی من! دە هەزار دینار لە دیدی مندا دینارێکە.

کابرای هەژار وتی: (خودایە! ئێستا کە وایە، دینارێك بدەرە بەندە کۆڵەوارەکەت).

مەلا نەسرەدین وتی: (باشە! تەنیا چرکەیەك چاوەڕێ بە).

**سەرنج:** سەرکردنە سەر (شایان)ی کوڕم فێری کردووم کە هیچ کەسێك وەکو منداڵێك، هار و هاج نییە. منداڵان حەز دەکەن هەرچییەك کە بیانەوێ، دەستبەجێ بە ئامادەیی لەبەردەمیاندا بێت. ئەگەر لەپڕ حەزیان لە میوە بێت، هیچ گوێ لە قسەی دایکیان ناگرن کە باوك چەند خولەکێکی تر ئەو میوەیە دێنێتەوە کە حەزیان لێیە. ئەوان دەیانەوێ هەر لەو ساتەدا میوەکە بخۆن...

ئەمەش کتومت مۆدێلی ئەقڵیی مرۆڤە ناسەرکەوتووەکانە. ئەوان پەلەیانە، نائارامن. حەز دەکەن دەستبەجێ بگەنە خواستەکانی خۆیان بێ ئاگا لەوەی کە:

**هەموو شتێك ئەوەندە دەخایەنێ کە پێویستە.**

**(ئەگەر تایبەتمەندییەك بتوانێت جیاوازیی نێوان پیاوێك و منداڵێك وەسف بکات، بێگومان ئەو تایبەتمەندییە (ئۆقرەگرتن)ە)**

**(لێنس ئارمسترۆنگ)**

تۆژەرێك لە زانکۆی فلۆریدا بۆی دەرکەوت کە گەیشتن بە پلەی مامۆستایەتی لە بوارێکی تایبەتدا بەشێوەیەکی ناوەند دە ساڵ کاری بەردەوامی لەو بوارەدا پێویستە و ئەمەش واتە ئۆقرەگرتنی لەڕادەبەدەر.

ساڵانێك شەمعی دڵم داگیرساندووە و سووتاندووە

تا لە پەروانە دەرسی عشقم وەرگرتووە

بۆ گەیشتن بە ئەنجام دەبێ ئۆقرەگر بین. ئۆقرەگرتن واتە ژیرانە واقیعگەرایانە رەفتارکردن. ژیری واتە دەرککردنی ئەو راستییەی کە لەنێوان ئێمە و خواستەکانماندا هەمیشە مەودایەك هەیە، مەودایەك کە دەبێ ببڕدرێت. مەودا واتە کات، کاتێك کە دەشێ ساڵانێك بخایەنێت.



**بە مانگ و بە ساڵ بیر دەکەمەوە و لەسەدا نەوەدونۆی ئەنجامەکان هەڵە دەردەچن، بەڵام لە سەدەمین جاردا هەموو شتێك دروست دەردەچێت.**

**(ئەلبێرت ئەنیشتاین)**

# سەرکەوتن واتە درەختکاری

من سەرکەوتن بە چاندنی درەختێك دەچوێنم. بۆ هەبوونی درەخت سەرەتا دەبێ تۆوێك لە خاکدا بچێنین. ئاوی بدەین. تۆوەکە پاش ماوەیەك چەکەرە دەکات و سەر لە خاك دێنێتە دەر.

دەبێ پارێزگاری لە چەکەرەکان بکەیت تا ببن بە نەمام. دەبێ نەمام ئاو بدەیت، دەبێ پەین بکەیتە ناو ئەو خاکەی کە نەمامەکەی تێدایە، دەبێ ژەهرپڕژێنی بکەیت و ئاگادار بیت کە زیندەوەرە گیاخۆرەکان زیان بە نەمامەکە نەگەیەنن. بەم چاودێری و هەوڵانەوەیە کە نەمامە بچوکەکە دەبێتە درەختێکی بەهێز، درەختێك کە دەتوانین لە ژێر سێبەرەکەیدا پشوو بدەین و سوود لە میوەکانی وەربگرین.

بەڵام مرۆڤە نائومێدەکان وەکو چاندنی تۆوی لۆبیای سیحراوی دەڕووانن سەرکەوتن و کامەرانی.

ئەوان حەز دەکەن سبەی ئەو رۆژەی کە تۆوەکان دەچێنن، درەختێکی گەورە ببینن...بێ ئاگا لەوەی کە ئەم چیرۆك و دیدگایانە تەنیا لە ئەفسانەکاندا هەن. لە دنیای واقعیەتەکاندا بۆ هەبوونی درەختی سەرکەوتن دەبێ زەحمەت بکێشیت، عەرەق بڕێژیت و ئۆقرە بگریت.

> **ئۆقرەگرتن و چاوەڕێ بوون، بەرزترین ئاستی ژیرییە.**
>
> **(ئینالتی)**

من بە مرۆڤەکەی ناو ئاوێنەکەوە دەست پێدەکەم. داوای لێدەکەم شێوازەکەی بگۆڕێت.دەربڕینێکی لەوە روونتر نییە کە ئەگەر بتەوێ دنیا بۆ شوێنێکی باشتر بگۆڕیت، سەیرێکی دەوری خۆت بکەیت و پاشان ئەو گۆڕانەی کە پێویستە ئەنجامی بدەیت.

(سیڤاگارت گۆلن بالارد)

## گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی سامان

## (تا تۆ نەگۆڕێیت هیچ شتێك ناگۆڕێت)

...مەلا لە سەرەمەرگدا وەسیەتی کرد لە کۆنە گۆڕدا بینێژن. وتیان: بۆچی؟ وتی: بۆئەوەی کاتێك نەکیر و مونکەر دێن و ئەبینن گۆڕەکەم کۆنە، ئیتر سین و جیم لەگەڵ ناکەن.

**سەرنج:** مرۆڤی بێ توانا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەستەی نالێهاتوویی کە لە خۆیدا هەستی پێدەکات، لەبارەی پرسیارلێکران و وەڵامدانەوە فریو دەخوات. لە راستیدا پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوان هەستی باوەڕبەخۆبوون و بەرپرسیارێتی لەئەستۆگرتندا هەیە. بەمشێوەیە تۆ چەندەی زیاتر هەست بە توانا و هێز بکەیت، بەشێکی زیاتری بەرپرسیارێتی لەبەرانبەر ژیانتدا قبوڵ دەکەیت و چەندەی هەست بە ناچاری و بێ توانایی زیاتر لەناو خۆتدا ئەزموون بکەیت، هەوڵێکی زۆرتر بۆ لابردنی ئەرکی خۆت پیشان ئەدەیت.

## پەیوەندیی گرتنەئەستۆی بەرپرسیارێتی و ئازادی

کەسێك کە ڕۆحیەتی بڕوابەخۆبوونی نییە پێی وایە بە ڕاکردن لە قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی، ئاسودەیی و ئاسایشێکی زۆرتر بەدەست دێنێت و خۆی لە تۆمەتی خراپ بەڕێوەبردن لە ژیانیشدا بێبەری دەکات، بەڵام نازانێ کە ڕاکردن لە بەرپرسیارێتی و بە هۆکار زانینی هەلومەرج و هۆکارەکانی تری بەدەر لە ئیرادەی تاکەکەسی بە مانای فەرامۆشکردنی ماف هەڵبژاردن و دیاریکردنی چارەنووسی ژیانە. لەلایەکی ترەوە قبوڵکردنی بەرپرسیارێتی چەنێك تاڵ و سەخت دیارە، لەبەرانبەردا ئازادی و ماف بڕیاردان و بە ڕەسمی ناسینی هێزی ئیرادەی لەگەڵدایە. ئەم هەلومەرجە دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێگەمان لە کارلەسەرکراوێکەوە ببێتە کارتێکەرێکی کاریگەر و هۆکاری نکوڵی نەکراو لە پێکهاتنی چۆنایەتی ژیان بگۆڕێت.

مەسەلەکە زۆر سادەیە. کاتێك ئێمە پەنا بۆ بە هەزار و یەك بیانوو دەبەین تا خۆمان بە بەرپرسی هەلومەرجی هەنوکەیی ژیانمان لەقەڵەم نەدەین، بەشێوەیەکی نائاگایانە هێزی هەڵبژاردنمان بۆ هێنانەکایەی گۆڕانکاری خوازراو لە ژیانی خۆماندا دەسڕینەوە و ئەو کاتەی کە ژیانی ئەمڕۆمان بە بەرهەمی ئەو هەڵبژاردنانە لەقەڵەم دەدەین کە لە ڕابردوودا ئەنجاممان داون، ڕۆڵ و ئیرادەی خۆمان بۆ گۆڕینی هەلومەرج سەلماندووە.

> **لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی و کاروباری ژیان بەو مانایەیە کە هەرگیز ئەویتر بۆ هیچ کارێك، هەر لە لەدایکبوونتانەوە تا ئەنجامدانی کارە ڕۆژانەییەکان یان هەبوونی هەستێکی تایبەت سەرزەنشت نەکەیت. تەنانەت تۆفیش نەڵێیت.**
>
> **(سۆزان جێفەرز)**

له شکستەوە گەیشتن بە سەرکەوتن سادەترە لە گەیشتن بە سەرکەوتن لە بیانوو و پۆزشەوە.

## دۆزینەوەی بیانوو

...مەلا کە زۆر بانگەشەی ئازایەتی و لێهاتوویی دەکرد، بۆ جەنگ رۆیشت. لە رۆژانی یەکەمدا لای هاوتاکانی باسی ئازایەتییەکەی لە جەنگەکانی تردا دەکرد. لەکاتێکدا کە هەموویان لەبارەی وەسفەکانییەوە هاتبوونە جۆش، رۆژیان دەژمارد تا جەنگ دەستپێبکات و هونەرەکانی مەلا ببینن. دواجار جەنگ سەری هەڵدا. مەلا بە قەڵغان و شمشێرەوە چووە گۆڕەپان. رکابەر بەبێ ماندووبوون و زۆر بەئاسانی ئەوی بەزاند.

لەبارێکدا کە خەریکی گریان بوو لە مەلایان پرسی: (بۆچی تۆ بچوکترین بەرەنگاریت نەکرد و وەڵامی هێرشەکانی رکابەرەکەت نەدایەوە؟)

وتی: (بە دەستێکم قەڵغانم هەڵگرتبوو و بەدەستەکەی تریشم شمشێر...هەردوو دەستم گیرابوون، خۆ نەمدەتوانی بە ددانەکانم بجەنگم!)

سەرنج:

**کرێکاری خراپ عەیب لە ئامێرەکانیدا دەدۆزێتەوە.**

**(پەندی ئینگلیزی)**

مەلا لەبری ململانێ و ئەنجامدانی ئەرکی خۆی دەستیکرد بە بیانوو هێنانەوە و خستنەرووی بەڵگە بۆ شکستەکانی. ئەو نەك تەنیا سوودی لەو ئیمکاناتە نەبینی کە لەبەردەستیدا بوو، بەڵکو بە هۆکاری شکستەکەی زانین. ئەمەش روانگەیەکە کە خەڵکانی شکستخواردوو هەیانە.

**٩٩٪ی شکستخواردووەکان لەو کەسانەن کـە عـادەتی بیانودۆزینـەوەیان هەیە.** **(جۆرج واشنتن کاروەر)**

خاڵی گرنگ لە بیانوو دۆزینەوەدا ئەوەیە کە تەنانەت ئەگەر تاکەکەس قبـوڵترین و بەجێترین بەڵگە بۆ شکستەکانی خۆی بڵێـت، هـیچ کاتێك کاریگەرییـەك لـە ئەسڵی مەسەلەکەدا نابێ. ئەسڵی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێمە دەگەینە ئەنجامـە دڵخوازەکـان یان ناگەین. هێنانەوەی بیانووی بە رواڵەت بەجێ بۆ روونکردنـەوەی ئـەم مەسـەلەیە کە بۆچی سەرکەوتوو نەبووین، هیچ کاتێك تۆزقاڵێك لە گـۆڕینی ئـەنجام و بارودۆخـە هەبووەکەدا کاریگەر نابێت.

**پاداشت دەدەنە ئەنجام نەك هۆکارەکان.**

**(وینستن چەرچل)**

کاروبـاری دنیـا بـەو جۆرەیـە کـە بوونـەوەرەکان نـەك لەسـەر بنـەمای بیـانوو و هۆکارەکـان، بـەڵکو لەبەرانبـەر هەوڵـەکان، لێهـاتوویی و شایسـتەییەکانمان دەمانگەیەنێتە شوێنی مەبەست...عاریفی گەورە (ئەبوسەعید ئەبولخەیر)یش دەڵێت:

**بەهەشت دەدەنە بەها نەك بەهانە.**



**من سەرکەوتنەکەم دەگێڕمەوە بۆ ئـەوەی کـە هـەرگیز هـیچ بیانوویـەکم نەهێناوەتـەوە و هـیچ بیانوویەکیشـم قبوڵ نەکردووە.**

**(فلۆرانس نایتەنگڵ–بونیادنەری پیشەی پەرستاری)**

ئەگەر چاوەڕێ بین تا هەموو شتێك لەسەداسەد دابین
دەبێت، هەرگیز هیچ کارێك دەست پێناکەین.
(ئیڤان تورگنێف)

## ناتووانی لە ئەگەردا دابنیشیت

...مەلا نیوەشەو لە خەو راپەڕی. ژنەکەی لە خەو هەڵساند و داوای لێکرد شقارتەکە هەڵگرێت و شەمعەکە داگیرسێنێت. پاش دانەگیرسانی شەمعەکە، ئەو بە دەنگی بەرز قسەکەی خۆی دووپات کردەوە.

ژنی مەلا لە وەڵامدا وتی: (ئێرە بە رادەیەك تاریکە کە ناتووانم شقارتەکە بدۆزمەوە. ئەگەر تۆ شەمعەکە داگیرسێنیت، من حەتمەن شقارتەکە دەدۆزمەوە).

سەرنج: ئایا ئەم رستە و رستەی تری هاوشێوە بەلای تۆوە ئاشنا نین:

ئەگەر لە خێزانێکی باشتردا لەدایك بوومایە،

ئەگەر لە وڵاتێکی تردا بهاتمایە دنیاوە،

ئەگەر تۆ فڵان کارت ئەنجام دەدا...

ئەگەر فڵان هەلومەرج دەڕەخسا..

زۆربەی بێ دەسەڵاتەکانی ژیان لە ئاراستەکردنی هەنگاودکان یان کەم کارییەکانی خۆیاندا بە گشتی سوود لەو رستانە وەردەگرن کە بە وشەی مەرجی (ئەگەر) دەست پێدەکات. لەکاتێکدا کە بۆ گەیشتن بە ئەنجام دەبێ هەموو (ئەگەر) و (مەگەر)ەکان بەلاوە بنێیت و بە سازدانی ئیرادە و لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی، کۆنترۆڵی ژیان بگریتە دەست و هەلومەرجی دڵخواز بهێنیتەکایەوە.

**بە ئەزموون بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر هەمیشە چاوەڕێی ساتێکی نموونەیی بیت، واتە ئەو کاتەی کە هەموو شتێك بە تەواوی دڵخواز و پەسەندە، لەوانەیە هەرگیز کارێك ئەنجام نەدەیت. لەم بارەدا لوتکەی هیچ شاخێك ناگیردرێت، هیچ پێشبڕکێیەك سەرکەوتن فەراهەم ناکات و هیچ خۆشییەکی درێژخایەن نایەتەکایەوە.**

**(موریس شوالیە)**

وتنی (ئەگەر) کاری ئەو کەسە تەنبەڵ و بێ ئیرادانەیە کە بۆ ئاراستەکردنی کەم کاری و شکستەکانی خۆیان چارەیەکیان نییە جگە لە پەنا بردن بۆ هێنانەوەی لیستێك بیانوو. ئەوان زەوی و کات و هەلومەرجی نایاریدەدەر بە هۆکاری سەرکەوتوونەبوونی خۆیان دەزانن. بۆ دەستپێکردنی هەر کارێك چاوەڕێ هەلومەرجی یاریدەدەرن بێ ئاگا لەوەی کە هەلومەرجی یاریدەدەر شتێکە کە زۆربەی کات بەرپرسیارێتی خۆیانە بیهێننە کایەوە. بۆ سوودمەندبوون لە نیعمەتەکانی ژیان دەبێ بەرپرسانە هەوڵ بدەین و لە ئەگەر و مەگەر و بەڵامدا دانەنیشین.

گەورەترین دوژمنی مرۆڤ لە دڵی خۆیدا بۆسەی ناوەتەوە.

(سێنێکا)

## دۆست و دوژمن

...مەلا شەیتانی لە خەویدا بینی، ریشی گرت و پێی وت تۆ دوژمنی مرۆڤیت و مایەی ئەو هەموو خراپەکارییانەیت. لە خەو هەڵسا، ریشی خۆی لەدەستی دابوو.

**سەرنج:** کاتێ بەرپرسیارێتی هەموو چاکی و خراپییەکان، شکست و سەرکەوتنەکان لە ژیاندا لە ئەستۆی خودی تاکەکەس بێت، بەو مانایەیە کە مرۆڤ جگە لە خۆی دۆست و دوژمنی نییە. هەرچییەك پێی بگات، چ درێوی و چ جوانی لەلایەن خۆیەوەیەتی.

**هەر جۆرە چاکییەك بە تۆ بگات لەلایەن خوداوەیە و هەر خراپەیەك بگات لەلایەن خودی خۆتەوەیە.** **(قورئانی پیرۆز)**




ریپۆرتەرێك پرسیاری لە (مایکڵ دێڵ)ی بەرێوەبەری گشتیی کۆمپانیای دێڵ کرد کە یەکێکە لە گەورەترین کۆمپانیاکانی کۆمپیوتەر لە جیهاندا: (کام رکابەر، گەورەترین مەترسی بۆ کۆمپانیای دێڵ دەهێنێتەکایەوە؟) مایکڵ دێڵ لە وەڵامدا وتی: (گەورەترین هەڕەشە بۆ ئێمە لەلایەن کارمەندانەوەیە)

( مایکل دل)

## ئامادەیی بۆ گۆڕان، سامانە

...مەلا لە بیابان خەریکی هەڵکەندنی زەوی بوو، کابرایەکی خەڵکی ناوچەکەی ئەوێ بینی و لێی پرسی: (مەلا ئەوە خەریکی چیت؟) مەلا لە وەڵامدا وتی: (شتێکم لەم بیابانەدا لەژێر خاك شاردووەتەوە، بەڵام ئێستا چەندەی دەگەڕێم نایدۆزمەوە). پیاوەکە وتی: (دەبووایە نیشانەیەك دابنێیت).

مەلا وتی: (نیشانەیەکم داناوە). کابرا وتی: (نیشانەکە چییە؟) مەلا لەکاتێکدا کە بە دەست ئاماژەی بۆ ئاسمان دەکرد وتی: (لەوێ پەڵە هەورێك بە ئاسمانەوە بوو، بەڵام نازانم بۆ کوێ چووە!)

**سەرنج:** مەلا هەوری کردبووە پێوەری خۆی، هەورێك کە هیچ کاتێك لە ئاسماندا نامێنێتەوە و جێگیر نییە.

پێش ئەوەی بە گەمژەیی مەلا پێبکەنین دەبێ پرسیار لە خۆمان بکەین ئاخۆ ئێمە کام شتە گۆڕاوانە دەکەینە پێوەری خۆمان؟

لە ژیاندا هەوری زۆر هەن. هەوری هەلومەرج، هەوری گۆڕانەکان، هەوری دەرفەتەکان و هەوری ڕێگەچارەکان.

### تۆ ناتووانیت کێشەکانی خۆت بە ڕێگەچارەکانی دوێنێ چارەسەر بکەیت.

ئەو هەورانەی کە لە ڕەتبووندان، ئەو هەلومەرجەی کە لە گۆڕاندایە، ئەو دەرفەتانەی کە خەریکە لەدەست دەچن، ئەو ڕێگەچارە نوێیانەی کە لە کۆنبووندان و ئێمە لە زۆر رووەوە ئاگاداری ئەم وەرچەرخانانە نین و بە مۆدێلەکان، تێڕوانین و

دیدەکانی دوێنێمان بیر لەو ئەمڕۆ و سبەیە دەکەینەوە کە چیتر وەکو دوێنێکان نین و هەموو بێ سەروبەری و پەرتەوازەییەکان لێرەوە دەست پێدەکەن.

**کەسێك کە دەچێتە راوی باڵندە، دەبێ جوڵە و گۆڕانکاریی بەردەوام بکاتە بنەما.**
**(لی لوکا، رزگارکەری کۆمپانیای ئۆتۆمبێل سازیی کرایسلەر)**

ئەو رستەیەی کە دەڵێت (گۆڕانی تۆ بنەمای جێگیری ژیانە) ئیتر بووە بە پەندێك. گۆڕان شتێکە کە مرۆڤ لە سپێدە دەمی مێژووەوە بینەری ڕوودانی بووە. بەڵام گۆڕانکارییەکان لە سەردەمی ئێمەدا لەخۆگری تایبەتمەندیی گەورەن. گۆڕان و وەرچەرخانەکان فراوان و خێرا بوون. لە کۆڕە زانستییەکاندا قسە لەسەر ئەوەیە کە زانینی مرۆڤ هەر چەند ساڵ جارێك (کەمتر لە دەیەیەك) دووقات دەبێ. ئەمە بەو مانایەیە کە ئەو زانینەی مرۆڤ لە ماوەی دەیەیەکدا بەدەستی دێنێت، یەکسانە بە هەموو مێژووی مرۆڤایەتی. ئینتەرنێت خەریکی گۆڕینی مێژوو و چارەنووسی جیهانە. سیمای کۆمەڵگاکان و وڵاتان، پەیوەندییەکان و ئاڵوگۆڕەکان، ستراتیژەکان و تێڕوانینە مرۆییەکان لە ئاستی لۆکاڵ و گلۆباڵدا وەها خێرا لە گۆڕان و وەرچەرخاندان کە ئەگەر
کەسێك لە چەند دەیەیەکی پێشووەوە سەیرێکی کۆمەڵگەی هەنووکەیی ئێمە بکات، سەری دەسوڕمێت.

لە سەردەمی وەرچەرخانی گەورە و خێرادا دەژین. ئەمە بەو مانایەیە کە دەبێ لە هەموو ساتێکدا بیر لەو ئەمڕۆیە بکەینەوە کە تیایداین و هاوکات دەبێ بڕوانینە ئەو ئایندەیەی کە بەخێرایی لە حاڵەتی گۆڕاندایە بۆ ئێستا. مرۆڤە چالاك و بڕوابەخۆکان

دەزانن هاوهەنگاوی لەگەڵ وەرچەرخانەکاندا مەرجی بەردەوامبوونە لە دنیای وەرچەرخاوی ئەمڕۆدا.



**وەکو کۆمپیوتەرێك کە کۆن بووە و پێویستی بە تازەکردنەوە (ئەپدەیت)ە، بە پێویستی دەزانین کە هەموو ڕۆژێك بیر و باوەڕەکانی خۆمان ئەپدەیت بکەین.**

**(دین گرازیۆی)**

## لەبارەی گۆڕانەوە دەبێ سەرنج بدەینە چەند خاڵێکی ژێرەوە:

١–گۆڕان شتێکە کە هەنوکە لە ڕووداندایە. کەسێك کە ئاگاداری نەبێت، ناتووانێت لەو سبەنێیەدا بژیت کە لەگەڵ ئەمڕۆدا جیاوازە.

٢–دەبێ پێشبینی گۆڕانکارییەکان بکەیت. (بنەمای ئایندەبینی)

٣–دەبێت خۆت لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا بگونجێنیت. (بنەمای نەرمی و کشۆکی)

٤–بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا دەبێ هەموو ڕۆژێك فێر بیت و گەشە بکەیت. (بنەمای گەشە)

## مرۆڤە کۆنەکان، سەردەمی نوێ

–وەستانی گۆڕان واتە وەستانی ژیان.

**(بروس بارتون)**

–بۆ مانەوە دەبێ بگۆڕێیت.

**(پێرل بیلی)**

–(بوون) واتە گۆڕان، (گۆڕان) واتە پێگەیشتن و (پێگەیشتن) واتە بەردەوامی پرۆسەی کارای لەدایکبوونەوە.

**(هێنری بێرگسن)**

–تەنیا دوو گروپ ناتوانن بیروباوەڕی خۆیان بگۆڕن. مردووەکانی گۆڕستان و شێتەکانی نەخۆشخانە.

**(وین دایەر)**

–لە سەردەمی گۆڕاندا، ئەوانەی کە ئەهلی فێربوون بن، میراتگری زەوی دەبن.

**(ئەریك هۆفەر)**

–هەروەکو چۆن جلی کۆن لەبەر دادەکەنیت، بیری کۆنیش لە خۆت دوور بکەرەوە.

**(سەعید نەفیسی)**

–لە دوا راڤەدا، گەورەیی و مەزنایەتی بەشێوەیەکی بەرفراوان لە چەمکی ئازایەتیدا شوێن دەگرێت، بوێریش لە راکردن لە باوەڕە کۆنەکان و پێوەرە سڕدراوەکان و شێوازە پارێزکارەکانی ئەنجامدانی کارەکاندا جێگیر دەبێ.

**(جەیمز هارۆی رۆبنسن)**

دەستبەجێ باجی گۆڕان بدە. ئەگەر ئەم کارە نەکەیت، باجی نەگۆڕان ئەدەیت.

## لە گۆڕانکاری مەترسە

جوتێك بەبەغا (توتی)م هەبوون کە بە دەگمەن لە قەفەسەکانیان دەهاتنە دەر و کاتێکیش دەهاتنە دەر زۆربەی کاتیان بە گەڕان بە بنمیچ و دەوروبەری قەفەسەکەدا بەسەر دەبرد. ئەو ژوورە بچوکە هەموو دنیای ئەوان بوو. هەوڵم نەدەدا باڵندەکان لە قەفەس بهێنمە دەرەوە و بیانبەمە حەوشەی پشتەوە. رووناکییە زۆرەکە و فەزا کراوەکەی نارەحەتیان دەکردن بە رادەیەك کە زۆر تورە دەبوون.

رۆژێکیان بەیانییەکەی لەوپەڕی سەختی سەرمای زستاندا، بۆ پێدانی کاهووی رۆژانەیان چوومە لایان. درەنگم بوو و جلەکانم لەبەر کردبوون. هەر کە بەلای قەفەسەکەدا چەمامەوە، دوو باڵندەکە تۆقین. پەرەکانیان دەلەرزی و چاویان دەرپۆقیبوو و هیچ جوڵەیەکیان نەدەکرد.

سەرم سوڕما. ئەبێ چ شتێك چووبێتە ناو دنیای ئەو باڵندە هەست ناسکانە و تورەی کردبن.

جوڵەیەکی ترم ئەنجامدا. باڵندە هەراسانبووەکان دەستیانکرد بە فڕین. تەنیا ئەو کاتەی کە کشامەوە ئینجا دووبارە هەڵنیشتنەوە بەڵام بە بەدگومانییەوە لە منیان دەڕوانی. لەپڕ ئەوەم بە مێشکدا هات کە شتێك ئەوانی نارەحەت کردووە: ئەو دوو بەبەغایە هیچ کاتێك منیان بە کڵاوەوە نەبینیبوو...ئاگایی مرۆڤیش وەکو کردارەکانی ئەم بەبەغایانەیە. لە گۆڕان و وەرچەرخان دەپەشۆکێت و لە شتە نائاشناکان دەترسێت.

**(رۆبەرت مارسی)**

ئاینــدە بــە ڕووی ئــەو کــەس و ڕێکخراوانــەدا داخراو دەبێـت کـە توانـای ڕاکردنیـان نییـە لـە ڕابردوو.

(گرەی هامێل)

## پێشبینی

..ڕۆژێکیان مەلا نەسرەدین چووە بازاڕ قۆرییەکی جوانی کڕی. خەریکی گەڕانـەوە بوو بۆ ماڵەوە کە لە ڕێگە لەبەر خۆیەوە وتـی: (ئەگـەر ئـەم قۆرییـە لـە ماڵـەوە بـەر زەوی بکەوێت ڕوودەدات؟)

دواتر خۆی وەڵامی خۆی دایەوە: هیچ! چارم نییە جگە لەوەی بیهێنم بۆ بازاڕ لای تەقەڵبەند تا بۆم بلکێنێتەوە.

پاشان مەسەلەکەی کەمێك لە ئەقڵیدا هێنا و برد و بەمشێوەیە ئـەنجامگیری کـرد: ئەمە چ کارێکە بڕۆمــەوە ماڵەوە...ئەگـەر قۆرییەکـە بـەر زەوی بکـەوێت و بکشـێت و دیسان بێمەوە بازاڕ پارچەکان بلکێنمەوە بە یەکتری، ئەمە هەمووی کات بەفیڕۆدانە. با قۆریەکە بدەمە تەقەڵبەند تا چاکی بکاتەوە و لەم ڕووەوە خەیاڵم ئاسودە بکەم).

مـەلا چـەندەی بـیری کـردەوە هـیچ ڕێگایـەکی باشـتری شـك نـەبرد. قۆرییەکـەی بەردایەوە سەر زەوی و بردییە لای تەقەڵبەند تا بۆی پێکەوە لکێنێتەوە.

**سەرنج:** مەرج نییە پێشبینی بە مانای هەڵچنینی شتی نەرێنی و نێگـەتیف بێـت و ئەوەی کە مەلا لەم بەسەرهاتەدا ئەنجامی داوە، کردار نییە لەسـەر بنـەمای ئەگـەری ڕوودانـــی خـــراپترین ڕووداوە مومکینـــەکان، بـــەڵکو ئامـــادەیی و جوڵەیـــە بـــۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو هەلومەرج و بارودۆخانەی کە هەنوکە پێشبینی دەکەین.

پێشبینی و ئایندەبینی، (ئامادەیی) دەهێننەکایەوە و هەبوونی ئامادەیی بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەر هەلومەرجێکدا پێداویستی سەرکەوتنە لە ژیاندا. مەولەوی لە (مەسنەوی)دا چیرۆکی زەڕەنگەر و کابرای بەساڵاچووی گێڕاوەتەوە کە زۆر بە باشی بەهای بیرکردنەوە لە دەرەنجام و پێشبینی هەلومەرجی ئایندە پیشان دەدات. کەسێك چووە لای زەڕەنگەر و داوای تەرازووەکەی لێکرد تا زێڕەکەی بکێشێت. زەڕەنگەر وتی: بێژنگم نییە. کابرا وتی رابواردن بەسە، وتم تەرازووم بدەیە نەك بێژنگ.

زەڕەنگەر وتی: وایە گوێم لێ بوو خۆ کەڕ نیم. بەڵام تۆ کەسێکی بەساڵاچوویت کە دەستەکانت دەلەرزن، زێڕەکەی تۆ وردەی زۆری تێدایە و بەو دەستە لەرزۆکانەی تۆ لەکاتی کێشاندا بەشی زۆری زێڕەکە دەڕژێتە سەر زەوی. دوایش داوام لێدەکەیت تا گسکی لێبدەم و هەمووی هەڵگرمەوە. جا لەبەرئەوەی لەگەڵ تۆزوخۆڵەکەدا تێکەڵ دەبن داوای بێژنگم لێدەکەیت تا لێکی جیا بکەیتەوە. لەبەرئەوەی گسك و بێژنگیشم نییە، ئەو قسەیەی یەکەم جارم کرد.



**گۆڕانی گەورە دنیا دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و ئەگەر لەگەڵ گۆڕاندا نەجوڵێین ئەوا دەبینە قوربانیی گۆڕان.**

**(جۆن.ئێف کەنەدی)**

لـه رەچـاوكردنى بنەماكانـدا وەكـو تاشـەبەرد
پايەدار بن، بەلام لە هەلبژاردنى شێوازدا لەگەل
تەوژمى ئاودا مەلە بكەن.

(تۆماس جێفەرسن)

# كشۆكى و گونجان

...لە مەلايان پرسى: (گەمژەترين مرۆڤ كە لە ژيانتدا بينيبێتت كێيە؟)

لـه وەلامـدا وتـى: (رۆژێكيـان دارتاشـێك بـۆ ئەنـدازەگرتنى دەرگـا چـووە مالێـك. لەبەرئـەوەى مەترەكـەى بـير چـووبوو، دەسـتەكانى درێـژ كـرد و هـەر بـەو شـێوەيە هێشتنيەوە. كاتێك ويستى بڕواتە مالەوە، بەردەمى خۆى نەبينى و كەوتە چالێكەوە. خەلكى هاتن تـا رزگـارى بكـەن. وتيـان دەسـتت بێنـە تـا بتهێنينـەدەرەوە، كـابراى دارتاش لە وەلامدا وتى:

(ناتووانم دەستمت بدەمێ، لەبەرئەوەى ئەندازەكە تێك دەچێت، بەلام دەتووانيـت ريشم بگريت).

سەرنج: كشۆكى يان رەقيمان ديارى دەكات كە لە ريزى بێ ئەقلەكاندا بين يان بـە هۆشمەند هەژمار بكرێين. كشۆكى واتە واقيعبينى.

واقيعبـينى بريتييـە لـە خۆگونجانـدن لەگـەلێ راسـتييە نكـولێ نـەكراو و حاشاهەلنەگرەكانى ژيان بە جۆرێك كە بيانكەينە پێوەرى برياردان و كردارى خۆمان. گـۆڕان حەقيقـەتى گـەورەى ژيانـە و كەسـانەى بـەهێز كـە دەبـێ خۆيـان لەگـەلێ راستييەكان بگونجێنن.

# درامای سێبەر

ئێستا کە سەرقاڵی خوێندنەوەی ئەم کتێبەن، لەکاتێکدا کە هەلومەرج ڕێگەتان پێ بدات کتێبەکە بەلاوە بنێن و پشت بکەنە ڕووناکی (گڵۆپ یان ڕووناکی خۆر)، سەیری سێبەری خۆتان بکەن. پاشان دەستی خۆتان هەڵبڕن.

ئەبینن کە سێبەری دەستەکانتان بەرەو سەرەوە دەچێت. سەرتان بجوڵێنن. سێبەری سەرتان دەجوڵێت. پێتان بەرز بکەنەوە، سێبەری پێتان دەجوڵێت....

هەروەکو تێبینی دەکەیت، سێبەرەکەت بە تەواوی لەگەڵتدا گونجاوە، لەگەڵ هەر گۆڕانکارییەکتدا سێبەرەکەت پەرچەکرداری هەیە. تۆ ڕاستەقینەیت و سێبەرەکەت ناڕاستەقینەیە. هەر لەبەر ئەمەیە کە نەك تۆ بەڵکو سێبەرەکەت خۆی لەگەڵ تۆدا دەگونجێنێت.



**تەنیا بەهێزترین و هۆشمەندترین بوونەوەرەکان لە مانەوەی خۆیان بەردەوام نابن. ئەو بوونەوەرانە لە مانەوەیان بەردەوام دەبن کە بتوانن خۆیان لەگەڵ دەوروبەردا بگونجێنن.**

بۆ هەر کوێیەك بڕۆیت سێبەرەکەشت لەگەڵتا دێت. دەبێت وەکو سێبەر بەدوای ڕاستییەوە بیت. ڕاستی (گۆڕان)ە. هەروەکو چۆن سێبەر بەبێ تۆ شوناسی نییە، ئێمەش بەبێ ڕاستی هیچ نین. بگۆڕێن تا لە چاڵی کێشەکان بێنە دەرەوە.

وەرە با لەژێر باران پیاسە بکەین

قسەی نەبیستراو بکەین

نویَ بلَیَین و نویَ بیر بکەینەوە

عادەتی کۆن تێك بدەین

لەبارانەوە کەمێك فێر ببین

کە ببارین و کەم بدوێین

قەڵەمی ژیان بە دەستی دڵەوەیە

وەرە با لاپەڕەی ژیان هەڵدەینەوە

**(موجتەبا کاشانی)**

## گەشە و بالآخوازی سامانە

...لەناو کۆمەڵێکدا، کەسەکان باسی تایبەتمەندییەکانی پیری و گەنجێتییان دەکرد. هەموویان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە هێزی مرۆڤ بە تێپەڕینی تەمەن کەم دەبێتەوە. بەڵام مەلا نەسرەدین ئەم قسەیەی قبوڵ نەبوو. ئەو بڕوای وابوو: (من لە تەمەنی پیریشدا هەر ئەو وزەیەی گەنجێتیم هەیە!)

کەسێك پرسی: (مەبەستت چییە؟ دەتووانی بانگەشەکەت بسەلمێنیت؟)

مەلا وتی: (لە حەوشەکەی ئێمەدا بەردێکی زۆر گەورە هەیە. کاتێك گەنج بووم زۆر هەوڵمدا تا بیجوڵێنم، بەڵام هەرگیز سەرکەوتوو نەبووم. ئێستاش ناتووانم ئەو کارە بکەم).

**سەرنج:**

### با هەموو ڕۆژێك لە دوێنێمان باشتر بین

کام کارانە هەن کە لە ڕابردوودا توانای ئەنجامدانیانت نەبووە و ئەمڕۆش توانای ئەنجامدانیانت نییە؟ کام کارانە هەن کە لە ڕابردوودا توانای ئەنجامدانیانت هەبوو، بەڵام ئەمڕۆکە ناتووانیت ئەنجامیان بدەیت؟

کام کارانە هەن کە لە ڕابردوودا ئەنجامت نەدەدان بەڵام ئەمڕۆش توانای ئەنجامدانیانت هەیە؟

ئەگەر ژمارەی ئەو کارانەی کە لە ڕابردوودا نەتدەتووانی ئەنجامیان بدەیت و ئەمڕۆ بە ئاسانی دەتووانی دەرەقەتیان بێیت، دەردەکەوێ کە تۆ لە گەشە و بەرەوپێشچووندایت. ئەگەر ژمارەی ئەو کارانەی کە پێشتر توانای ئەنجامدانیانت نەبووە نەگۆڕاوە، ئەوا تۆ لە حاڵەتی کپی و تەپ بووندایت.

دواجاریش ئەگەر کار و هەنگاوی زۆرن هەن کە لە رابردوودا ئەنجامدانیان بۆ تۆ ئاسان بووە بەڵام ئەمڕۆ ئەنجامدانیان مەیسەر نییە بۆت، بزانە کە لە رووبەری ئاوابووندایت.

بەپێی ئاستی گەشە، فێربوون و وەرچەرخان دەکرێ ژیانی هەر کەسێك بۆ سێ رووبەر دابەش بکرێت:

١-بەرەوپێشچوون

٢-وەستان

٣-دواکەوتن

ئاستی گۆڕان و گەشەی هەر کەسێك دیاری دەکات کە ئەو لە چ قۆناغێکی ژیانیدایە.

**ئەگەر هەمیشە کارێك هەر بەو شێوەیە ئەنجام دەدەیت کە پێشتر ئەنجامت دەدا، ئەوەی کە پێشتر بەدەستت دەهێنا چیتر بەدەستی ناهێنیت، چونکە دنیا گۆڕاوە.**

دنیا کپ و وەستاو نییە، بەڵکو لە گەشە و وەرچەرخاندایە. لە بەشی پێشوو باسی خۆگونجانمان کرد لەگەڵ وەرچەرخاندا. گەشە، واتە خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو دنیایەیکە بەرەوپێش دەڕوات و کەسێك کە لە گەشە و بەرزبوونەوە دوا دەکەوێت، واتە لە بەرەوپێشچوونی ژیاندا دواکەوتووە.

**ئەو شتەی زیندوو لە مردوو جیا دەکاتەوە، چ لەناو گیاکان و چ لەناو مرۆڤەکاندا، گەشە و نەشونما کردنە.**

# فێربوون ناچاری نییە، مانەوەش هەروا

پێش ماوەیەك بە (ئێس ئێم ئێس)ێك سەرم سوڕما كە ئەمەی تیا نوسرابوو: (زیاتر لە دوێنێ و كەمتر لە سبەینێ خۆشم دەوێت) و ئەمەش واتە گەشەی بەردەوام لە خۆشویستندا.

مرۆڤە باڵاخوازەكان لە عەشق، لەكار، لە فێربوون و هێنانەكایەی وەرچەرخانە دەروونییەكاندا هەمیشە لە گەشەدان. ئەوان لە ئێستادا ژیانیان زۆرتر لە دوێنێ و كەمتر لە سبەینێ پێ دەزانن، كار پێدەكەن و خۆش دەوێ. دوو رۆژیان یەكسانی یەكتر نییە. ئەمڕۆ لە دوێنێ باشترن و دەیانەوێ سبەینێیەك دروست بكەن كە باشتر بێت لەمڕۆ...هەر بونیادێكی رێكخراوەییش دەبێ مۆدێلێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت.

بەڕێوەبەرێكی دەركراو دەیگوت: (من بچوك نەبوومەتەوە، دنیا گەورەتر بووەوە).

بۆ بەرابەربوون دەبێ پابەند بین بە فێربوونی بەردەوام. **مامۆستای گەورە كەسێكە كە فێرخواز بێت.**

جیهان بە خێرایی لە گەشە و وەرچەرخاندایە. پێوەرەكان، ستانداردەكان و زانیارییەكانی پێشوومان لە ژینگەی نوێدا چیتر كاریگەری و بەهایان نەماوە.

كۆنە بكەرە دەرەوە گەر مەیلی نوێت هەیە

**(مەولەوی)**

**بازاڕەكان خێراتر لە مەعریفەی بازاڕدۆزیی ئێمە دەگۆڕێن.**

**(بازاڕدۆزێك)**

له تەمەنی ۸۳ ساڵیدا (فرانك لوید رایت)ی بیناسازی گەورە و ناوداریان پرسی: (لەو کارە گەورانەی کە کردووتە کامیانت زۆرتر بەدڵە)

وتی: (کاری دواتر)

دەبێ کاری دواترتان، ڕۆژی دواترتان و خودی دواترتان باشتر، مەزنتر بێ لە کار و ڕۆژ و تاکێتی دوێنێتان، چونکە ژیان و سەرکەوتن ئامانجێك نییە بەڵکو سەفەرێکە، سەفەرێك کە تاوەکو کۆتایی تەمەن هەیە. سەرکەوتن، پێشکەوتنی بەردەوامە نەك بەرەو خاڵی کۆتایی بەڵکو هەڵزنانێکی دووبارەیە بەسەر شاخ و بەرەو لوتکەی تر...

**سەرکەوتن یەکسان نییە بە گەیشتن بە ئامانج، بەڵکو سەفەرە.**

**(ئەگەر مامۆستایت، هێشتا باشترین وانەی خۆت نەوتۆتەوە،**

**ئەگەر بیناسازیت، هێشتا باشترین بینایەی خۆت دروست نەکردووە،**

**ئەگەر بازرگانیت هێشتا باشترین گرێبەستی خۆت نەبەستووە،**

**کاتی ئەوە هاتووە هیوای خۆت زیاد بکەیت. وێناکانت فراوانتر بکە و بارودۆخەکانی دواتر ئامادە ببە. باشترین ڕۆژەکان لەبەردەمتدان، هێشتا باشترین ڕۆژەکانی ژیانت بەسەر نەبردووە...)**

**(جوێل ئاستین)**

**(بواری بەرەوپێشچوون)**

لە کەسێکیان پرسی: (دەتەوێ ببیتە شا؟)

وتی: (نا)

وتی: (بۆچی؟!)

وتی: (چونکە بواری بەرەوپێشچوونی نییە).

## زوو پیر دەبین و درەنگ ئاقڵ دەبین

...لە مەلایان پرسی: (تۆ گەورەتریت یان براکەت؟)

وتی: (من ساڵێك لەو گەورەترم، بەڵام ساڵێکی تر ئەمەنی لەگەڵ مندا یەکسان دەبێت).

سەرنج: پێدەچێ شتی وەها مومکین نەبێت، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئەگەر ئێمە بەرانبەر ساڵەکانی پێش خۆمان شتێکی نوێ فێر نەبووبین، زانیاریمان زیادی نەکردبێت و ژیرتر نەبووبین، ئەوا تەمەنمان زیادی نەکردووە:

**هەمیشە پیر دەبین، بەڵام کەسێك نییە زیرەك ببێت.**



**کەسێك کە لە پەنجا ساڵیدا هەر وا لە دنیا بڕوانێت کە لە بیست ساڵیدا روانیوویەتی، سی ساڵ لە تەمەنی بەهەدەر داوە.**

**(محەمەد عەلی کلای).**

لە عەباس عەبدولموتەلیب (مامی پێغەمبەر د.خ)یان پرسی: (تۆ گەورەتری یان پێغەمبەر؟) لە وەڵامدا وتی: (من بەتەمەنترم، بەڵام ئەو گەورەترە)

دیپاك چۆپرا بڕوای وایە کە: (تەمەن ژمارەیەکە). لە راستیدا هەر کەسێك سێ تەمەنی هەیە:

١-تەمەنی ناسنامە

٢-تەمەنی جەستەیی

٣–تەمەنی ئەزموونی–ئەقڵانی

تەمەنی ناسنامەیی هەر کەسێك ئاشكرایە و بەم پێیە کەسەکان خۆیان بە بەتەمەن یان گەنج دەبینن. تەمەنی جەستەیی ئاماژەیە بە کرداری فزیۆلۆژی (کارئەندامی)ی جەستە و ئاستی سەلامەتی و شادیی کەسەکە. دەشێ کەسێك پەنجا ساڵ بێت بەڵام لەرووی پزیشکی و جەستەییەوە ئەوەندەی کەسێکی حەفتا ساڵ دارِزابێت.

تەمەنی راستەقینەی تاکەکەس پەیوەندی هەیە بەو باڵاخوازی، ژیری، هۆشیاری، تێڕوانین و بینایيەی کە بەدرێژایی ژیانی خۆی بەدەستی دێنێت. لەم رووەوە کەس هەیە کە بە پێی ساڵژمێر بە بەساڵاچوو لەقەڵەم دەدرێت، بەڵام لەرووی تەمەنی دەروونی و مەعنەوی پێنەگەیشتوو و منداڵە و کەچی کەسانێکیش هەن کە بەتەمەنن و تێڕوانین و گەشەی بەتەمەنەکانیان هەیە.

## هەندێ لە مەرگەکان تەمەنێك دەخایەنن

قوتابی لە مامۆستاکەی پرسی: سەعدی لە کام ساڵەدا وەفاتی کرد؟

مامۆستا وتی: ئەو لەنێوان ساڵانی ٦٩٠ بۆ ٦٩٤ی کۆچیدا مردووە.

قوتابی وتی: (دیارە داماوە تەنیا چوار ساڵ ژیاوە!

ژیانی هەندێ کەس تەمەنێك هەوڵ، باڵاخوازی و بەرەوپێشچوونە و ژیانی هەندێکی تریش تەمەنێك پوچی، بێ سەروبەری و هێشتنەوەی گیانە.

## ئەو ژیانەی من ژیام مردنێکی پەیتاپەیتا بوو
## ئەو ژینەی جەستەم بەڕێیکرد بە تەمەن حسابم کردبوو

لە تاکە تاکی ئێمەدا گەنجینە و سەرچاوەی توانا هەن کە لە زۆر رووەوە هەرگیز یان زۆر کەم کەڵکیان لێوەرگیراوە.

تراژیدیی ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە کە هەمیشە دوورابیەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی کە هەین و ئەوەی کە دەتووانین ببین. چیرۆکی ژیانی ئێمە حیکایەتی ئەو کەسانەی کە خاوەنی ملیۆنان دینارمان لە حسابی بانکی خۆماندا هەیە بەڵام بێ ئاگاین لەوەی کە ئاخ و حەسرەتدا دەژین. ئێمە ئازار دەچێژین، فشاری دارایی زۆرمان دێتە سەر، بەڵام ئاگادار نین لەوەی کە سەرمایەیەکی مەزنمان هەیە.

هەموو فشار و ناخۆشییە داراییەکان ناپێویستن و بەهۆی بێ ئاگاییەوەن. بێ ئاگایی لە گەورەترین ئەو داراییەی کە هەیە: گەنجینەی مەزن لەو بەهرە خواداوانەی کە چاوەڕێی دۆزینەوە و دەرهێنانن.



**ژیان وەکو بایسکیلێك وایە کە چەند گێڕێکی هەیە، زۆرجار ئێمە هەندێ گێڕمان هەن کە کەڵکمان لێوەرنەگرتوون.**

**(چارلز شولەر)**

لە کتێبی **(تەمەن کورت نییە، ئێمە کەمتەرخەمین)** چیرۆکێکم گێڕاوەتەوە کە هی مارك تووەینە و بەشێوەیەکی کاریگەر دەربڕی ئەم تراژیدییەیە:

پیاوێك دەمرێت و لە دەروازەی بەهەشت چاوی بە (قەدیس پیتەر) دەکەوێت. دەستبەجێ بیری دەکەوێتەوە کە قەدیس پیتەر پیاوێکی زیرەك بووە. پێی دەڵێت: (من ساڵانێکە گرنگی بە مێژووی سەربازی ئەدەم، پێم بڵێ گەورەترین جەنەراڵی هەموو سەردەکان کێ بووە؟).

قەدیس پیتەر بە خێرایی وەڵام دەداتەوە: (پرسیارێکی زۆر سادەیە. ئەو پیاوەیە کە لەوێ وەستاوە).

کابرا وەڵام ئەداتەوە: (بێگومان لە هەڵەدایت. ئەو پیاوەی کە تۆ ئەیڵێیت من لەسەر زەوی ئەمناسی. ئەو کرێکارێکی ئاسایی بوو).

قەدیس پیتەر لە وەڵامدا ئەڵێت: (بەڵێ راست ئەکەیت هاوڕێ، ئەگەر ئەو بووبایەتە جەنەراڵ، گەورەترین جەنەراڵی مێژووی لێ دەردەچوو).

تێبینی: دۆزەخ بۆ ئێمە لەو رۆژەوە دەست پێدەکات کە خودا بەرچاوڕوونییەکمان دەداتێ تا بەئاگابێینەوە لەو شتەی کە دەمانتووانی ببین، لەو شتەی کە دەمانتووانی پێی بگەین، لەو شتەی کە لەدەستمانچووە و لە هەموو ئەو شتانەی کە دەمانتووانی ئەنجامی بدەین و ئەنجاممان نەدا.

**ئەو توانایانەی کە هەمانە هیچ بایەخێکیان نییە بۆمان. شێوازی سوودوەرگرتنمان لە تواناکانمان بۆ ئێمە بەها و بایەخ دەهێنێتە کایەوە.**

**(مادلین ئەنگل)**

کاتێك دەتووانین کەسێکی بەکەڵکتر بین لەوەی کە هەین، کاتێك کە دەتووانین باوك و دایکێکی باشتر بین لەوەی کە هەنوکە هەین، کاتێك کە دەتووانین

بەڕێوەبەرێکی باشتر بین لەوەی کە هەین. کاتێک کە دەتوانین شارەزایەتیی زۆرترمان هەبێ لەوەی کە هەنوکە هەمانە، کاتێک کە دەتوانین شتی زۆرتر لەوەی کە تا هەنوکە دەیزانین فێر بین، کاتێک کە دەتوانین هاوسەر، هاوکار، دراوسێ و هاوڕێیەکی باشتر بین لەوەی کە هەنوکە هەین، و بە کورتی دەتوانین کەسێکی خۆپێگەیەنەرتر بین لەوەی کە هەین و نین، بەو مانایەیە کە ئێمە لە دۆزەخدا دەژین. دۆزەخ واتە دەستپێوەگرتن لە خۆدا. دۆزەخ واتە ژیان لە ئاستی زۆر خوارتر لەو ئاستەی کە خوا بە مرۆڤی بەخشیووە.

دەك لەم ژیانە شەرمەزار بم        بەندایەتی بکەم کاتێک سالار بم

**حەز دەکەم کاتێك لە قیامەت لە قاپی خودا دا ئامادە دەبم، تۆزقاڵێك توانام نەمابێتەوە کە نەمخستبێتە کار و بتوانم بڵێم: خودایە! من کەڵکم لە هەموو ئەو تواناییانە وەرگرتووە کە تۆ پێت بەخشیووەم.**

**(ئێما بامبەك)**

ئەگـەر هـەموو ئـەو کارانـە ئـەنجام بـدەین
کـەتوانای ئەنجامـدانیانمان هەیـە، سـەرمان
دەسوڕمێت.

(ئەدیسۆن)

## خۆ پشکوتن سامانە

...هاوڕێکـانی، مـەلایان بـینی کـە دەسـتێك و چـاوێك و قاچـێك و کونـەلوتێك و گوێچکەیەکی خۆی بەستووە. وایانزانی نـەخۆش کـەوتووە. بـۆ ئەحواڵپرسـی چـوونە مـاڵی و وتیـان: (خــوا خــراپ نەیات...جــەنابی مــەلا، بــەڵا بــەدوور بــێ، چــی روویداوە...بۆچی دەستێك و قاچێك و لایەکی سەرت و چاوێکت بەستووە؟!)

مەلا پێکەنی و وتـی: (مـن سـاغم، بـەڵام بۆئـەوەی دەسـتپێوەگرم و ئەندامـەکانی جەستەم بێ هۆ کار نەکەن، نیوەیانم بەستووەتەوە).

**سەرنج:** لەوانەیەم ئەم کارە دەبەنگانە دیار بێت کە کەسـێك بـۆ دەسـتپێوەگرتن، نیوەی ئەندامەکانی جەستەی خۆی بێ سوود بهێڵێتەوە، بەڵام کاتێك وردتر بـڕوانین، بۆمان دەردەکەوێت ئەمە کارێکە کە زۆرێك لە ئێمە لە ژیاندا گرتوومانەتە بەر. ئێمەی مرۆڤ بـە باشـترین شـێواز سـوود لـە توانـا و لێهاتووییـەکانی خۆمـان نـابینین. وەکـو بوونەوەری بەتوانا و لێهاتوو، ئاسـت و رووبـەری لـەباردابوونمان تـا کۆتـایی تەمـەن وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

**خەڵکی کانزا گەلێکن هەر وەکو ئاڵتون و ئەڵماس. (پێغەمبەر (د.خ)**

مــرۆڤ بــۆ ئــەوە دروســت نــەبووە کــە لــە سەرانسەری ژیانیدا هەر بە منالّی بمێنێتەوە.
(جان جاك رۆسۆ)

## باوك و دایكی خۆم

...گەڕیدەیەك لەدرێژایی سەركێشییەكانیدا گەیشتە گوندەكەی مـەلا نەسرەدین. ئەو دەیویست دوای گەڕانەوە لە سەفەرەكانی، بیرەوەرییەكانی خـۆی بنووسێتەوە. لەم رووەوە هەوڵیدا پرسـیاری جۆراوجـۆر لـە كەسـانی جیاجیـا بكـات و بیروبـاوەڕ و بۆچوونی خەڵكی هەموو ناوچەیەكی وڵات بەدەست بێنێت.

گەڕیدەكە چەند رۆژێك میوانی مەلا بـوو. رۆژێكیـان كـە پێكـەوە خـەریكی گەشـت بوون لە گوندەكەدا، گەڕیدەكە لە مەلای پرسی: (ئـەرێ لـە گوندەكـەی ئێـوە پیـاوی گەورە و بەناوبانگ هاتوونەتەدنیاوە؟)

مەلا پاش كەمێك تێڕامان لە وەڵامدا وتـی: (بـەڕێزم، لـە گوندەكـەی ئێمـەدا تـەنیا منالّ دێنەدنیاوە!)

**سەرنج:**

**خۆت بیڵێ كـە دەتـەوێ چ جـۆرە مرۆڤێـك بیـت. بۆیـە هـەر كارێـك كـە پێویستە ئەنجامی بدە تا بگەیتە ئەو شتەی كە خۆت ئەتەوێ.**
**(ئەپیكتیتۆس)**

رستەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: مەزنەکان لەدایك نابن، بەڵکو دروست دەبن. گەورەترین ئەرکی هەر کەسێك، پەروەردەبوون و سوودوەرگرتنی خوازراوە لە لێهاتوویی و وزە ناوەکییەکانی. باوك و دایکان گەورەمان دەکەن، بەڵام دەبێ هەموو کەسێك ئەرکی خۆی وەکو باوك یان دایکێك پەیوەست بە خۆی دەرك بکات. ئەبراهام مازلۆی دەروونناسی گەورە کە ناوەکەی پەیوەندیدارە بە چەمکی خۆوالاکردن دەڵێت:

**دەبێ ئامانجی کۆتایی مرۆڤ ئەوە بێت ببێتە هەر کەسێك کە ئەتوانێ.**

**وەکو یاسایەکی گشتی دەتوانین بڵێین، هۆکاری سەرکەوتنی مرۆڤ، ئەو تواناییانەی نییە کە لەگەڵیاندا دێتە دنیاوە، هۆکاری سەرکەوتنی، مرۆڤێکە کە لە خۆی دروستی دەکات.**

...مەلا لە بیابان خەریکی هەڵکەندنی زەوی بوو، کابرایەکی خەڵکی ناوچەکەی ئەوی بینی و لێی پرسی: (مەلا ئەوە خەریکی چیت؟) مەلا لە وەڵآمدا وتی: (شتێکم لەم بیابانەدا لەژێر خاک شاردووەتەوە، بەڵآم ئێستا چەندەی دەگەڕێم نایدۆزمەوە). پیاوەکە وتی: (دەبووایە نیشانەیەک دابنێیت). مەلا وتی: (نیشانەیەکم داناوە). کابرا وتی: (نیشانەکە چییە؟) مەلا لەکاتێکدا کە بە دەست ئاماژەی بۆ ئاسمان دەکرد وتی: (لەوێ پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە بوو، بەڵآم نازانم بۆ کوێ چووە!)

سەرنج: مەلا هەوری کردبووە پێوەری خۆی، هەورێک کە هیچ کاتێک لە ئاسماندا نامێنێتەوە و جێگیر نییە.
پێش ئەوەی بە گەمژەیی مەلا پێبکەنین دەبێ پرسیار لە خۆمان بکەین ئاخۆ ئێمە کام شتە گۆڕاوانە دەکەینە پێوەری خۆمان؟
لە ژیاندا هەوری زۆر هەن. هەوری هەلومەرج، هەوری گۆڕانەکان، هەوری دەرفەتەکان و هەوری ڕێگەچارەکان.



مەلا نەسرەدینی ژیانی خۆم

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (٥٠٠٠) دینار